زنجیرەی ٨
بڵاوکراوەی کەپر

# خەمی مەستوورە

میران ئەبراهام

ڕۆمان
بەرگ: کەپر
دیزاینی ناوەوە: تاقانە
ڕێنووس: کەپر
چاپ: یەکەم ٢٠٢٠
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشـتیی کتێبخانە گشـتییەکان ژمارەی سـپاردنی (   )ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.

ئەم کتێبە بە پشتگیریی **ڕێکخراوی هاوکاریی ئەڵمانی** چاپ کراوە
Haukari e.V.

ئەم کتێبە لەلایەن **ناوەندی ڕۆشنبیریی ڕەهەندەوە** دابەش دەکرێت.

**"بۆ ئەو ژنانەی لە دوای تاوانی ئەنفال بە تەنیا بە جێ مان، ڕەشیان پۆشی و لە چاوەڕوانیدا پیر بوون، ئەو ژنانەی خەم و چارەنووسیان هاوشێوەی خەم و چارەنووسی مەستوورە بوو!"**

# ١

مەستوورە ئەمشەو دیسان خەونی بینیبوو. دەنگی هاوار و بانگ و گریان، دەنگی شریخەی ئەو گوللانەی لەناو چەمی باوەرووشە تەقێنران، کاتی هاتنی سەربازەکان، دەنگی گریانی منداڵ و قیژەی ژنەکان، کاتێک ئەو خەڵکەی لەوێ خۆیان شاردبووەوە و ئاشکرا بوون. بەردەوام ڕووداوەکانی ئەو چەند شەو و ڕۆژە بە خەون دەبینێتەوە، دەنگی ئەو گوللانەی تەقێنران؛ هێشتا لە گوێکانیدا دەزرنگێنەوە، شوێنەواری خوێنی ئەو دوو پیاوەی یەکەم کەس پێوە بوون.

لەناو ئارەقەی جەستەی خۆیدا خووسابوو، لە ترس و سەرمادا دەلەرزی و لەسەر قەراغی تەختی خەوەکەی دانیشتبوو، سەرسام لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە لە دەرەوەی ڕوانی، هەوا پاک و ڕوون و ڕووناکیی مانگ دەیدا لەسەر ترۆپکی درەختەکان، ئەستێرەکان

گەورە و بچووک؛ گەش بە ڕووی ئاسماندا پەرشوبڵاو بووبوون، وەکوو بە نووکی دەرزی کونی ورد ورد لە پارچەیەک قوماشـــی ڕەش کرابێت، لە دووکانی ســـەوزەفرۆشـــەکە لەســـەر شـــەقامی شەست مەتری؛ دەنگی داگرتن یان بارکردنی سندووقی پلاستیکی بەتاڵ دەهات. وەکوو ڕووی پەنجەرەکە تەمی کردبێت و دەرەوەی تەخت و خۆڵەمێشی دەهاتە پێش چاو، تاوەکوو چاوی چووە سەر پشـــتی پشـــیلە ســـوورەکەی کە لەو کاتەدا لەســـەر ڕەفەی بەر پەنجەرەکە پاڵ کەوتبوو. دوای ئەوەی ڕووی لێ وەرگێڕا و دیسان لە پەنجەرەکەی ڕوانییەوە، لەژێر لێوەوە گوتی: "کتە!"

کاتێک ناوی هێنا، پشـیلەکەی هاتە ژێر بەتانییەکەی. مەسـتوورە بەر چاوی ڕووناک بووبووەوە، بێ ئەوەی لە پشـیلەکەی بڕوانێ، دەســـتی برد و لە پشـــتیەوە و لەژێر بەتانییەکەیدا دەســـتی هێنا بەســـەر پشـــتیدا، چاوی زەق داچەقاندبوون و ســـەرنجی لەســـەر ڕەنگی زەردی ســـــەر ئەو دوو لقەدارە بوو کە لە بەر ڕووناکیی گڵۆپەکەدا لێوەی دیاربوو، پشیلەکە هاتبووە باوەشی و ئەو هێشتا سەرنجی لەسەر ئەو دیمەنانە بوو کە لە پەنجەرەکەوە لێوەی دیار بوون.

کاتێک پشـیلەکەی میاواندی، بیری کەوتەوە کە داوای نازی لێ دەکرد، پاشـــان تا تووکی ســـووری پشـیلەکەی نەبینی، بەر چاوی تەواو ڕووناک نەبووەوە.

لە دڵی خۆیدا گوتی: "کتە لە باوەشـــــم دەربکەم و خێرا بچم زۆپاکە دابگیرســـــێنم، ئەگینا بە هۆی ئەوەوە لەبیرم دەچێتەوە و سەرمام دەبێ و کۆڵنج دەکەم."

مەستوورە لەوە دەترسا ئەگەر بێدەنگ دابنیشێت و دەست بە پشتی پشیلەکەیدا بێنێت، ئیتر کات تێدەپەڕێت و خەیاڵی دەڕوات بۆ لای ئەو خەونانەی ئەو شەوە بینیونی. پشیلەکەی هەڵبڕی و تاوێک لەباوەشی گرت، لێی ڕوانی و پێی گوت: "تۆ چاک نووستوویت و خەمی هیچت لە سەردا نییە، جارێ ڕۆژ نەبووەتەوە، من شەوێکی درێژم لە پێشە."

خستبوویە سەر تەختی خەوەکەی و خۆی بۆ مەتبەخەکە بەڕێوە بوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: "تۆ تەنها ڕۆحلەبەرێکیت چارەی منت بوێت! هەر چەندە تەنها بە بۆن و دەنگ هەستم پێ دەکەیت!"

دوای تاوێک بێدەنگی، وەکوو بیری لێ کردبێتەوە؛ بەلوعەکەی بەر دایەوە و سەری کترییەکەی لا برد و خستیە بەر ئاوەکە، بە دەنگێکی کز گوتی: "خدر و کچەکانیش، وا بزانم خاوەری دایکیشم..."

کترییە فافۆنەکەی پڕ کردبوو لە ئاو، کاتێک گەڕایەوە ژوورەکەی، وەک لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "ئا، ئەی چۆن، خاوەری دایکیشم خۆشی دەویستم، بەس ئەو وەکوو تۆ کوێر نەبوو!"

پشیلەکەی بەشوێنەوە بوو، کترییەکەی لەسەر زۆپاکە دانا و چەرخێکی لە گیرفانی پاڵتۆکەی دەرهێنا. پاڵتۆیەکی سەوزی سەربازی بوو، ڕۆژێک شێخ بایز ئەو پاڵتۆیە لەبەری خۆی دادەکەنێت و بە مەستوورەی دەدات، پاشان پێی دەڵێت: "ئەوە دیاریی کەسێکی زۆر زۆر خۆشەویستمە، بەڵام بۆ تۆ، بە دیاری دەیدەم بە تۆ، چونکە شایەنتە، ئەو پاڵتۆیە ئەسڵە، زۆر ئەسڵە،

گرانبەهایە، ئەمەریکییە و تەنانەت بە ئاگریش ناسووتێ!" پێوەی دەنووست و بە شەو و ڕۆژ لەبەریدا بوو.

زۆپاکەی داگیرساند و پاشان لە پشیلەکەی ڕوانی و پێی گوت: "هەقی خۆتە داوای خواردنم لێ بکەیت، ئەگەر من لە ترسی خەڵکی بەد نەیەڵم تۆ بچیتە دەرەوە و تۆ بۆ خۆت نەتوانیت ڕاوی مشکێک، چۆلەکەیەک بکەیت، یان لە تەنەکەخۆڵی دراوسێکاندا پارچە نانێکت دەست بکەوێت، ئیتر دەبێ خۆم خەمت بخۆم!"

چوو لەسەر تەختی خەوەکەی دانیشت، کتە چووە باوەشیەوە و لێی ڕوانی و بەردەوام دەیمیاواند، ئەویش لەباوەشی گرت و پێکەوە بۆ مەتبەخەکە گەڕانەوە.

جامێکی باغەی شینی پڕکردبوو لە ئاو، تاکی سەرەوەی کەوانتەرەکەی کردەوە و زەرفێکی دەرهێنا، دەستی کرد بە زەرفەکەدا و چنگێک نانەڕەقەی دەرهێنا و کردیە ناو جامە ئاوەکەوە، پاشان پێکەوە بۆ ژوورەکە گەڕانەوە. کتە لەسەر زەویی ژوورەکە لە ئاوی جامەکەی دەخواردەوە، دیار بوو دەیزانی جارێک زۆری دەوێت تا نانەکە دەخووسێت. مەستوورە لەو کاتەدا ئەمەی لەبەر خۆیەوە گوت: "ئەرێ ئەم شارە بۆ دەڵێی خۆڵی مردووی بە سەردا کراوە! تۆ بڵێیت چی ڕووی دابێت!"

لەو کاتەدا لە کتەی ڕوانی، بە خەیاڵ گەڕایەوە بۆ ئەو ڕۆژەی لەگەڵ کەسێک لە بازاڕ بەشەڕ هاتبوو. کاتێک کاتژمێر دوازدەی نیوەڕۆ دەبێت، دووکاندار و کاسبکارانی ناو شار لە نوێژی هەینی دەبن، مەستوورە شەقامەکانی شار بە چۆڵی دەبینێت، پاشان

هەمان قسـەی لە بەر خۆیەوە کردبوو: "ئەم شـارە دەڵێی خۆڵی مردووی بە سەردا کراوە!"

دوای ئەوەی شـەقامەکە قەرەباڵغ دەبێ و ڕێگای نابێت بڕوا، لە بێزاریدا دەڵێت: "جا کوا خوا ئەوەی بکردایە، ئیتر منیش لەدەسـت ئێوە ڕزگارم دەبوو!" لە کاتێکدا ئەمە دەڵێت، چاوی دەچێتە سـەر چاوی چەند پیاوێک و ئەوان بەسـەرنجەوە لێی دەڕوانن، پاشـان لەژێر لێوەوە دەڵێت: "ئەرێ ئەو خەڵکە شـێت بوون، خۆ ناوێرم لە ماڵ بچمە دەرەوە! بە هەر جێگایەکەدا بڕۆم، خەڵکی ئەم بازاڕە لێم دەڕوانن."

مەستوورە لەو ڕۆژەوەی لە دێی جەلەمۆرد ڕۆیشتبوو، ڕۆژانە کە لە ماڵ دەردەچوو؛ بەردەوام سـەری دادەخست و لە بەر پێی خۆی دەڕوانی. کاتێک سـەری هەڵدەبڕی و چاوی دەچووە سـەر چاوی کەسانی تر، شـەرم دایدەگرت و جەستەی ئارەقەی دەکرد، دڵی پەلەپەل لێی دەدا و هەستی بە بێزاری دەکرد، بێجگە لەوە لە چوونەدەرەوەیدا خۆیشـی نەیدەزانی داخۆ چ جلێک لە بەر بکات و چۆن بە ڕێگادا بڕوات!

دەستی بەسەر سەری کتەدا هێنا، پاشان ژێر چەناگەی گرت و سەری پێ هەڵبڕی و لێی ڕوانی: "کتە، دەزانیت ئەو ڕۆژە لە بازاڕ بۆچی بە شـەڕ هاتم؟ چونکە سـەگبابێکی نارەسـەن پێی گوتم: 'لادێیی بێئەقـڵ، بۆچی نـاڕۆیتەوە بۆ ئەو کـاولەیەی لێوەی هاتوویت!'، وەک بڵێی من لە هەولێر نانی دەسـتی ئەو بخۆم. تەنها لەبەر ئەوە بوو. داوای باقییەکەم لێ کردەوە، وای دەزانی ژنم و لادێیی و بێئەقڵم، ئاگام لە قوونی خۆم نییە و دەتوانێت پارەکەم

بخوات. دیار بوو، خێرا خواحافیزیی لێ کردم و منیش پێم گوت: 'دەی کاکە باقییەکەم نایەیتەوە!' ئیتر دیار بوو بەوە من ئەوم تووشــــی شـــەرمەزاری کرد، وا بزانم هەســــتی بە ئازاری کلکی کردبوو کە پێم پێدا نابوو. هەی بێنرخی ناچیزە! قســـەی بێمانا و ترۆهـــات. 'لادێیی، بۆچی نـــاڕۆیتەوە بۆ ئەو کـــاولەیەی لێوەی هـــاتوویت!'، وەکوو من لەســـــەر خواســـــتی خۆم لە جەلەمۆرد ڕۆیشتبم."

هەستا و چووە مەتبەخەکە: "کتە، ئەگەر تۆ بیرم نەخەیتەوە نان بخۆم، خۆ لە برساندا دەمرم!"

پاشان دوو سەرینی خستبووە سەر یەک و پاڵی پێوە دابوون، دیســــــان لــە دەرەوەی ڕوانی، دیمـەنـەکـان لـە جێگـای خۆیـان نەجوولابوون، چاوی لە ڕووناکیی گڵۆپەکان بڕییەوە، جار جار پارووییەکی لەو بابۆڵە نانە دەگرت، کەوچکێک کەرەی بە نانەکەدا ســـــویبوو. کتە هاتبوو لە باوەشــــیدا پاڵ کەوتبوو، دیار بوو نـەیهێشـــــتبوو نـانـەکـەی بخووســــێت، ئـاوی نـاو جـامـەکـەی خواردبووەوە. مەســـــتوورە بێ ئەوەی لێی بڕوانێ، پارچەیەک لە نانەکەی دەستی خۆی بە دەمی کتەوە کرد، پاشان دوا پارچە نانی جووی و کتەی توند لە باوەش گرت و سەری خستە سەر تووکی پشـــتی و گوێی لە ترپەی دڵی گرت، پاشـــان هەردووکیان پاش و پێش خەویان لێکەوت.

## ٢

مەستوورە لە پاسەکەدا لەنێوان بەهار و ژیاندا دانیشتبوو، خدری مێردی و نێرگز و کوێستان لە کورسییەکی پشتیانەوە بوون. سەرنشینانی پاسەکە، بێجگە لە سیانیان، هەموو خەڵکی دێی جەلەمۆرد بوون، ئەو ڕۆژە خەڵکی دێ هەموویان بە پاس بۆ شار بەڕێوە بوون. بێجگە لە بەروبوومی خۆیان، شەکر و چا تەنها کەرەستە بوو کە خەڵکی دێ لە شار پێویستیان پێی بێت، بەڵام ئەو ڕۆژە خەڵکی دێی جەلەمۆرد بۆ شەکر و چا کڕین بۆ شار نەدەچوون.

ئەو سێ کەسەی تری ناو پاسەکە بە ئەوان غەریب بوون، ئەوانیش شۆفێرەکە و دوو سەرباز بوون. دوو سەربازەکە لەناو دەرگای پاسەکە بەپێوە وەستابوون، لەو ساتەوەی لە دێی جەلەمۆرد دەرچووبوون، بەردەوام پێکەوە گفتوگۆیان بوو.

لەناو چەمی بابەرووشە کاتێک سەربازەکان هاتبوون، هاوار و گریان بە دۆڵەکەدا دەنگی دابووەوە. هەندێک کەس هەوڵیان دابوو خۆیان لە پێچولۆچی ئەو چەم و دۆڵەدا بشارنەوە، بەڵام هەر زوو دۆزرابوونەوە، پاشان گەورە و بچووکیان بۆ ناو دێ هێنابوونەوە. ئەو خەڵکەی لەوێ بوون، تەنها خەڵکی دێی جەلەمۆرد نەبوون، چونکە ڕۆژانی پێش ئەو ڕۆژە؛ خەڵک لە دێهاتەکانی تری ناوشوانەوە لە ترساندا بۆ ناو ئەو چەمە هاتبوون، بێجگە لەو ڕێبوارانەی بە ڕێکەوت ڕێگایان کەوتبووە سەر چەمی بابەرووشە و لەوێ مابوونەوە. مەستوورە هەموو جارێک دەڵێت: "کوڕە حەشاماتێکی زۆر لەو چەمە بووین، ئەوانەی لەوێ بوون؛ دوو ئەوەندەی دانیشتووانی دێکەی ئێمە دەبوون، هەزار کەس زیاتر دەبووین، ئیتر خۆ من زۆربەی ئەو خەڵکەم نەدەناسی!"

تەواوی دانیشتووانی گوند سواری ئۆتۆمبێلەکان کران، پاشان سەربازەکان بۆ ناو دێی جەلەمۆرد هاتن. پێشتر پیاوەکانی قاسمی فارس ئاغا بوون خەڵکەکەیان گرت و سواری پاسیان کردن. دوای ئەوەی ئۆتۆمبێلەکان بە ڕێگا گڵینەکەدا لە دێ دەرچوون، پیاوەکانی قاسم ئاغا پاداشتی ئازایەتیی خۆیان وەرگرت و هەر ئەوانیش بەبەر چاوی سەربازەکانەوە ئاگریان لە ماڵەکانی جەلەمۆرد بەر دا. سەربازەکان نەڕۆیشتن تاوەکوو دێی جەلەمۆرد داروبەردی بەسەر یەکدا خاپوور بوو، پاشان بە شۆفلێک دیوارەکانیان ڕووخاند. شەش دارتوو، زیاتر لە بیست دارهەنجیر؛ لەناو ئاوایی بوون. درەختەکان بەسەر هەردوو بەری ئاواییدا دابەش بووبوون. داربی و تووڕکەکانی قەراغ ئەو چەمەی جەلەمۆردی دەکرد بە

دوو بەشـــەوە، بە هێزی شـــۆفلەکە لە ڕەگوڕیشـــەوە دەریانهێنان، تەنها مزگەوتەکە نەبێت کە خاتریان گرت و نەیانهێشـــت بە ئاگر بسـووتێت، پاشـان چەند سـەربازێک "تی ئێن تی"یان لە بندیوار و ئاودەستەکانی دانا. کاتێک پیاوەکانی قاسم ئاغا مەڕومالاتیان پێش خۆیان دا و دێیان بە جێ هێشت و لە چاو ون بوو، سەربازەکانیش لـە دوورەوە مزگـەوتـەکـەیـان تـەقـانـدەوە. دوای ئـەوەی دێی جەلەمۆردیان بەجێ هێشـــتبوو، وردە کاغەزی زەردی کتێبەکان بەسەر داروپەردووی خاپووری ماڵەکاندا دەباری.

مەسـتوورە بە چرپە چەند جارێک بە بەهار و ژیانی گوت: "هەر چییەکمان لێ بەسەر بێت، دەست لە یەک بەر نادەین!"

بەلاچاوێک لە ســـەربازەکانی ڕوانی، ئەوان لە ســـەرنشـــینی پاســـەکەیان نەدەڕوانی و بەردەوام بە زمانی عەرەبی باســـیان لە ســـــەردەمی خوێندنیـان دەکرد. یـەکێکیـان گـەنجێکی بـالابـەرزی سوورکار بوو کە سەری لە بنمیچی پاسەکە توند بووبوو، ڕیش و سـمێڵی تاشـیبوو، بەردەوام دەســـتی ڕاســـتی بۆ ئاماژەدان بە قسەکانی؛ دەجوولاند. سەربازەکەی تر، بە بالا؛ سەری دەگەیشتە شانی هاوپیشەکەی و سمێڵێکی باریکی گەنجانە و پێستی قاوەیی دەینواند. ســـەربازە ســـوورکارەکە گوتی: "ڕاســـکۆلینکۆڤ پێش ئەوەی بچێ تاوانەکەی ئەنجام بدات، ویژدانی زۆری ئازار دەدات، بە جۆرێک وەکوو نەخۆش بەو شـــەقامانەدا دەگەڕێت و بەردەوام لە خەیاڵی خۆیدا شـەڕ لەگەڵ خۆیدا دەکات. لە پێشـدا دەیەوێت بە مەیخواردنەوە خۆی لەو خەیاڵە بەدەی ڕزگار بکات، هەر ناتوانێت،

پاشـــان بە بیانووی چوون بۆ لای هاوڕێیەکی کۆنی ســـەردەمی خوێندن دەیەوێت ســـەری خۆی هەڵبگرێت و لە دەســـت ئەو خەیاڵەی ڕابکات، کەچی هەر ناتوانێت و دیســـان دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو تەماعەی کە هەیەتی. ئیتر بزانە سەروەت و سامانی دونیا چەند کاریگەریی لەســـەر مرۆڤەکان هەیە. خێر دەکات و پارە بە هەژاران و لێقەوماوان دەدات تا دڵی خۆی لە خۆی ڕازی بکات و بۆ خۆی بســـەلمێنێت کە ئەوٚ پیاوچاکە و کردەوەی خراپی لێ ناوەشێتەوە، بەڵام لە ئەنجامدا ئەوانە هیچ چاری ئەو دەردەی ئەو ناکەن. جا ئەوە من بە کورتی بۆت باس دەکەم، خۆزگە خۆت دەتخوێندەوە، ئەوسا خۆت دەتزانی چەند کتێبێکی بێوێنەیە، باوەڕ بکە پڕە لە دەرس. ڕاســـکۆلینکۆڤ کارەکتەرێکی ناو ڕۆمانی ناوبراوە، خۆ کتێبەکە تەنها هەر باسـی ئەو کەسـە ناکات، دەیان و سەدان کەسی تری تێدایە کە باسی ژیانی خۆیان دەکەن."

دەسـتی خسـتە سـەر شـانی سـەربازە کورتەباڵاکە و سـەری دانەواند و لێی ڕوانی: "چۆن ئەو کتێبەت نەخوێندووەتەوە؟ ئەی تۆ چۆن دەڵێیت لە زانکۆی بەغداد خوێندوومە، کەچی ڕێکەوتی ئەو کتێبەت نەکردووە؟"

"وەکوو پێم وتیت، لە ماڵی ئێمە لە نەجەف بێجگە لە قورئان و تەفسـیر؛ هیچ کتێبێکی تر لە بەر دەسـتماندا نەبووە. دواییش کە چوومە زانکۆ و لە ڕێگای هاوڕێکانمەوە هۆگری خوێندنەوە بووم، ناوی ئەو کتێبەم لە هاوڕێکانم نەبیســـت، لە کتێبخانەی کۆلێژی زانســـتە ئیســـلامییەکان کتێبی لەو جۆرەی لێ نەبوو، چونکە

کتێبەکانی ئەو کتێبخانەیە هەمووی دەربارەی ئایینی ئیسلام بوون.'

'دەی خۆ ناوی نووسەرەکەیت بیستووە!'

'ناوی چی بوو؟'

'تاوان و سزا.'

'نا... نا، نووسەرەکەم مەبەست بوو!'

'فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی.'

'خەڵکی کوێیە؟'

'ڕووسییە.'

'ئێ! ئێ!'

'دیارە ناویت نەبیستووە!'

'کۆمۆنیستە؟'

'نەخێر، وا بزانم ئەو پێش سەرهەڵدانی کۆمۆنیستەکان لە ڕووسیا ژیاوە!'

'جا ئەوە زۆر کۆنە.'

'چۆن؟ کۆنە؟'

سەربازە سوورکارە باڵابەرزەکە دوای ئەوەی ئەمەی گوت، پێکەنی. پاشان هەردووکیان تاوێک بوو بێدەنگ بووبوون، لە دەرەوەی پاسەکەیان دەڕوانی و خەیاڵیان لەلای ڕووداوەکانی ناو چیرۆکی نووسەرە ڕووسییەکە بوو.

'منیش تاوەکوو نەچوومە زانکۆی موسڵ، لە ماڵەوە بۆم نەبوو بێجگە لە ئینجیل، هیچ کتێبێکی تر بە دەستمەوە ببینرێت، ئەو

سەردەمە لە عەینکاوە ئێمەش تەنها کتێبە دینییەکانمان شک دەبرد!"

لە کاتێکدا سەربازە سوورکارە بالابەرزەکە ئەمەی لەژێر لێوەوە گوت، وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت، مەستوورە بە دڵەتەپێ و پەشۆکاوییەوە ئاوڕی لە خدر و کوێستان و نێرگس دایەوە و پێی گوتن: "مەگەر بە مردن، ئەگینا لێک جیا نابینەوە!"

ئەو کاتێک ئەمەی گوت، شۆفێرەکە دەستی بە هۆڕینلێدان کرد، مەستوورە ڕاچڵەکی و لە ترسان گیانی لەرزی، خۆی کزەڵە کرد و لە کۆشی خۆی ڕوانی. شوفێرەکە لەگەڵ هۆڕینلێداندا سەری لە پەنجەرەی پاسەکەوە دەرهێنابوو، بە زمانی کوردی هاواری دەکرد. لە دووریی بیست مەترێک کەرێک لەگەڵ جاشەکەیدا دیار بوو، لەناوەڕاستی جادەکە وەستابوون. کاتێک پاسەکە لە ناچاریدا بۆ قەراغی جادە قیرەکە لای دا، هەموو سەرنشینەکان بە ڕاست و چەپدا دەکەوتن، بەسەر زیخ و بەردی قەراغی جادەکەدا لێی دەخوڕی. پاسەکە گەیشتە نزیکی کەرەکان و خەریک بوو تێپەڕێت، لەو کاتەدا جاشولکەکە هاتە بەردەمی پاسەکە، کاتێک پاسەکە بە سەریدا ڕۆیشت، سەرنشینەکان هەستیان بەوە کرد کە تایەی پێشەوە و دواوەی بەسەر گۆشت و ئێسقانی جاشولکەکەدا تێپەڕی. پاسەکە لە ڕێگاکە لای دا و کەوتە چاڵێکەوە، ئەو چاڵ و کەندەلانانەی ئاو بەتەنیشتی ئەو شەقامەدا دروستیان کردبوو. کاتێک پاسەکە لەسەر لا کەوتبوو، سەرنشینەکان کەسیان لە جێگای خۆیان نەمابوون و بەسەر یەکتریدا کەوتبوون. ئەو ئوتۆمبێلانەی لە دوایانەوە بوون کە زیاتر لە بیست پاس و

ئۆتۆمبێلی سـەربازی دەبوون ڕاوەسـتان، ئەوانەی لەپێش بوون لەگەڵ ئۆتۆمبێلە سـەربازییەکاندا ڕۆیشـتن و لە چاو ون بوون. سـەربازەکان یەک یەک سـەرنشـینەکانیان ڕزگار کرد، شـۆفێری پاسـەکە لەپێش هەموویانەوە هاتبووە سـەر جادە قیرەکە و لە دوورەوە دەسـتی لە یەک هەڵپێکان و لە کەر و جاشـولکەکەی دەڕوانی، دەنگی هەڵبڕی و گوتی: "لا حەولە وەلا قوەتە ئیلا بیلا!"

کاتێک لە پاسـەکە هاتنە دەرەوە؛ هەموو لەسـەر پێی خۆیان ڕاوەستابوون، مەستوورە و سەربازە سوورکارەکە نەبێت کە بە دەسـتەبەرە لە پاسـەکە دەریانهێنان، لەسـەر شـەقامە قیرەکە بەتەنیشـتی یەکەوە دایاننابوون. لە دوورەوە کەرەکە بەسـەر کەلاکی ئەنجن ئەنجنی جاشـولکەکەیەوە ڕاوەسـتابوو، سـەری بە سـەریدا شـۆڕ کردبووەوە و بۆنی پێوە دەکرد و لێی دەڕوانی، ئەفسـەرێک چوو بەرامبەر کەرەکە ڕاوەسـتا، دەمانچەکەی لە لاقەبرغەی دەرهێنا و بێ وەسـتان؛ دوو فیشـەکی بە سـەری کەرەکەوە نا، کەرەکە بەسـەر جاشـولکەکەیدا کەوت. لەگەڵ تەقەکاندا، خەڵکەکە بێدەنگ بوون و هەموویان لە ئەفسـەرەکەیان ڕوانی. مەسـتوورە لەگەڵ بیسـتنی تەقەکاندا، زریکاندی. لەناو دۆڵ و لاپاڵی شاخەکاندا، دەنگی مەستوورە لەگەڵ شریخەی گوللەکەندا تێکەڵ بوون و دووبارە بوونەوە. سەربازەکان و خەڵکی جەلەمۆرد و دێهاتەکانی تر وایان دەزانی مەسـتوورە لەبەر ئازار زریکاندوویەتی، سـەری لە دوو لاوە شـکابوو، هەناسـەی دەرنەدەهات و خدری مێردی بەردەوام دەستی بە پشتیدا دەهێنا، مەستوورە خۆیشی دەستێکی بە سنگیەوە گرتبوو.

سەربازە سوورکارە بالابەرزەکە دەستی شکابوو. مەستوورە نەیدەتوانی لەسەر لاق بوەستێت، یەکێک لە سەربازەکان برینەکەی بۆ پێچا. کچەکانی دەگریان و خدر تاوەکوو ئەو ساتەی مەستوورەیان خستە پشتی جێبەکە، دەستی بە دەستیەوە بوو، بەڵام دیار بوو ئەو زۆر ئاگای لای ئەوان نەمابوو، بەر چاوی تاریک و زوو زوو لەهۆش خۆی دەچوو. لەگەڵ سەربازە دەست شکاوەکەدا بەرەو نەخۆشخانە ڕۆیشتن.

هەناسەی بەگران بۆ دەدرا و سەر سنگی قورس بووبوو، دڵی بە جۆرێک خێرا لێیدەدا؛ هەستی دەکرد لە سنگیدا جێگای نابێتەوە. دەنگی فیشەکەکان لە گوێیدا دەزرینگانەوە، ئەو دیمەنەی کاتێک ئەفسەرەکە دەمانچەیەکی لەناو دەست و بەرامبەر ماکەرەکە وەستابوو، هەر کاتێک ئەو دیمەنەی دەهاتەوە پێش چاو؛ پەنجەی لە گوێکانی دەئاخنی، هەندێک جاریش فریای گوێ گرتن نەدەکەوت و ئەفسەرەکە خێراتر لەو، پەنجەی لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکەی دادەگرت.

# ٣

دەنگی گریان و هەنسکهەڵکێشانی لەناو ڕاڕەو و ژوورەکانی تری نەخۆشخانەکەوە دەبیسترا. لە چواردەوری خۆی ڕوانی، خێرا خۆی ڕاست کردەوە و لەسەر قەراغی تەختی خەوەکەی دانیشت، ناوچەوانی گرژ کرد و دەستی لە یەک هەڵگلۆفین، وەکوو بڵێی لە دەنگی گریانەکەی خۆی ترسابێت. پاشان خێرا هەڵسایە سەر پێ و بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ. ژوورەکە سێ قەرەوێڵەی تری تێدا بوو، کە لەو کاتەدا مەستووره لەو ژوورەدا تەنها نەخۆش بوو. چوو لە بەر دەرگاکەدا ڕاوەستا و لە لای ڕاست و چەپی ڕاڕەوەکەی ڕوانی، کچێکی سپیپۆشی کورتەباڵای قژکورت لە لای ڕاستی ڕاڕەوەکەوە بەرەو ڕووی هات، دیار بوو لە ژووری پەرستارەکان بوو کە دەکەوتە کۆتاییی ڕاڕەوەکە، لە دووریی

بیست مەترێکەوە بانگی لە مەستوورە کرد: "ئەرێ ژنەکە، تۆ ئەو هاوار و قیژەقیژەت لە چییە؟"

مەستوورە دوای ئەوەی لێی ڕوانی، بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، بۆ سەر تەختی خەوەکەی گەڕایەوە. بێدەنگ دانیشتبوو و دەستی لە یەک هەڵپێکابوون و توند سەری پەنجەکانی خۆی دەگوشی، سەری شۆڕ کردبووەوە و لە دەستی دەڕوانی، کاتێک پەرستارەکە هاتە ژوورەوە: "ئەوە بۆ کردووتە بە ڕۆژی خۆت؟"

"ئەوەندە خەونی ناخۆش دەبینم..."

"خەونی چی! ئەوە تۆ دوو ڕۆژە لێرەیت، بەردەوام یەکێکت دەوێت بەدیارتەوە بێت. سەر شکانێک ئەوەی دەوێت؟"

"ئەگەر ئێوە دەوایەکتان پێ دەدام!"

"دەوا؟ دەوا بۆچی؟"

"بۆ ئەو..."

"ئەوە نییە برینەکەیان بۆ پێچاویت؟ ئینجا ئەو تۆزە ڕووشاوییە، ئەو هەموو هاوار و گریانە دەهێنێت؟"

"ئێ ئاخر دادە گیان، نازانم زۆر خەممە، ئێ دەی چی بکەم؟"

"چۆن چی بکەیت! تۆ لەم نەخۆشخانەیەدا بە تەنها نییت، دەی پاڵ بکەوە و بێدەنگ بە!"

پەرستارەکە ئەمەی بە بێزارییەکەوە بە مەستوورە گوت، بە دەستێکی باڵی گرتبوو، بە تووڕەییەوە لێی ڕوانی و دەستی بە سنگیەوە نا و لەسەر تەختی خەوەکەی پاڵی خست، بەتانییەکی سەوزی پێدا دا و خۆی لە مەستوورە نزیک کردەوە، کە نەک بۆنی عەترەکەی بەڵکوو بۆنی ساردی ماسکارا و کلەکەی چاویشی،

هەناسـەیان توند کرد: "دکتۆر دوای کاتژمێرێکی تر دێت و ئیزنت دەدات."

"بۆ کوێ؟"

"بۆ دۆزەخ! بۆ ماڵەوە، قابیلە بۆ کوێ ئیزنت دەدات!"

"کام ماڵ؟"

"جا من چووزانم کام ماڵ!"

"دەی من چی بکەم؟"

"برۆ لە ماڵە کاولەکەی خۆت ئەوەندە بگری و بنەڕێنە، هەتا قورگت دەدڕێ. تێگەیشتیت؟"

کچەکە ئەمەی بە مەستوورە گوت، ئەویش لە پەرستارەکە مۆڕ بووەوە و توند مەچەکی گرت، وەکوو شـتێکی بیر کەوتبێتەوە: "ماڵە وێرانەکەی من! لە کوێ؟"

"دەک خوا لێت بەزیاد نەکات! جا من چووزانم لە کوێ!"

"دەی تۆ بڵێی ئەوان بۆ کوێ چووبن؟"

"بە خوا جوانە!"

"ئاخر خوشـکێ گیان، تۆ بڵێیت خدر و کچەکان بۆ کوێ چووبن؟"

"ئەرێ ژنەکە، خدری چی و کچی چی؟"

"چۆن..."

مەستوورە ئەوەندە توند مەچەکی گرتبوو، پەرستارەکە نەیتوانی خۆی لە دەستی ڕزگار بکات. پاشان بە دەستەکەی تری، قەراغی کراسە سپییەکەی گرت و بۆ لای خۆی ڕایکێشا، بە توورەیییەوە لە چاوی کچە پەرسـتارەکەی ڕوانی: "چۆن پێم ناڵێیت ئەوان بۆ

کوێ چوون؟ دەی چۆن هاوار نەکەم و نەگریم و قوڕی دنیا نەکەم بە سەری خۆمدا!"

تف لەنێوان لێوە وشـــکهەڵاتووەکانیـەوە دەردەپـەڕی و بـەر ڕوومەتی پەرســتارەکە دەکەوت، لە ترســاندا هاواری کرد: "فریام بکەون! کچینە فریام بکەون!"

تەختی خەوەکەیان بە جێ هێشــتبوو، لەناوەڕاسـتی ژوورەکەدا ڕاوەســتابوون و دەســتیان دابووە یەخەی یەکتری، باڵای کچە پەرســتارەکە دەگەیشــتە بنباڵی مەســتوورە. دوای ئەوەی پاڵێکی پێوە نا، بەسەر تەختی خەوەکەیدا خستی و بە سەریەوە ڕاوەستا: "تۆ وا دەزانیت من تێک چووم! دەی ئێســـتا من بۆ کوێ بچم و کوێیان بەدوادا بگەڕێم، ها! ها! پێم ناڵێیت؟"

مەستوورە ئەمەی بەدەم گریان و هەنسک هەڵکێشـانەوە گوت، ئاوڕی دایەوە ویسـتی لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە، لەو کاتەدا دوو ژن و پیاوێکی سـپیپۆش لەناو دەرگاکەدا پەیدا بوون، مەسـتوورە کاتێک لێی ڕوانین: "دەی دەی وەلا کەون، با بڕۆم و فریا بکەوم!"

دوای ئەوەی مەستوورە ئەمەی گوت، پەرستارەکان پەلاماریان دا و بردیانەوە ســـەر تەختی خەوەکە و پاڵیان خســـت. دوو ژنە پەرســـتارەکە گرتبوویان و پیاوەکەش دەرزییەکی ئامادە کرد، پاشـان شـانی مەسـتوورەیان ڕووت کرد، پیاوەکە دەرزییەکەی لێ دا: "ئەقڵی تێک چووە!"

پیاوەکە ئەمەی لە بەر خۆیەوە گوت، مەســتوورە بێدەنگ لێی ڕوانی، چاوی پڕ بوو لە فرمێسک: "دەک خوا غەزەبتان لێ بگرێت!"

"به خوا جوانه، دوای ئەو هەموو خزمەتەش، هێشتا دۆعامان لێ دەکەیت!"

پەرستارە کورتەباڵا قژ کورتەکە ئەمەی گوت، هاوەڵە ژنەکەی بۆی سەندەوە: "دەمت بە برین بچێ!"

تاوەکوو چاوی نووقاند، یەک یەک لێی ڕوانین. پیاوەکە لە هاوکارەکانی ڕوانی: "تەواو تۆپاندم. دەستی لێ بەر بدەن!"

دوای دوو کاتژمێر، کاتێک مەستوورە بەئاگا هاتەوە، هەمان پەرستار، ژنە کورتەباڵا قژ کورتەکە، بەدیاریەوە وەستابوو، مەستوورە لێی ڕوانی: "دەی ڕاست بەرەوە، ئەوە دکتۆر ئیزنی داویت، بەڵام دەبێ بوەستیت تاوەکوو پۆلیسەکان بەدواتدا دێن!"

ئەو نەخۆش و بریندارانەی لەو ڕۆژانەدا هێنرابوونە نەخۆشخانەکانی کەرکووک، لەژێر چاودێریدا بوون. مەستوورە وەڵامی نەدایەوە، ویستی لەسەر تەختی خەوەکەی؛ خۆی ڕاست بکاتەوە. دیار بوو لەبەر ئازاری ماسوولکەکانی ملی، نەیدەتوانی سەری لەسەر پشتییەکە هەڵبڕێت. بەدەم هەنسک هەڵکێشان و گریانەوە، زۆر بەهێواشی و لەژێر لێوەوە، زوو زوو لە پەرستارەکەی دەڕوانی، لە ترساندا بەچرپە و وەکوو بیەوێت لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "ئێستا من ڕوو لە کوێ بکەم، وەی کۆستکەوتوو خۆم!"

ئەو جلانەی لەبەردا بوو کە لە دێی جەلەمۆرد بۆ ئالیکدان بە مەڕوماڵات و ماڵینی گەوڕەکان لەبەری کردبوو، کراسێکی چیتی سەوز و ئێلەگێکی ڕەش و شەرواڵێکی پیاوانەی بەسەر دەرپێکەیدا

لەپێ کردبوو. کراس و ژێرکراسەکەی خستبووە ناو شەرواڵەکەی و توند بەنەخوێنەکەی بە سەردا بەستبوو، سەرپۆشێکی شینی بە سەریدا دابوو کە لەژێر ملیدا توند لچکەکانی لە یەک گرێ دابوو.

لەبەردەم پەرستارەکەدا هاتە سەر چۆک و دانەوییەوە و جزمە شینەکانی لەژێر قەرەوێڵەکەیدا دەرهێنا و لەپێی کردن، بەرامبەر پەرستارەکە ڕاوەستا و لە یەکتریان ڕوانی: "تۆ لادێییت؟"

مەستوورە وەڵامی نەدایەوە و بێدەنگ لە ژوورەکە چووە دەرەوە، لە ڕاڕەوەکەدا بەلای دەستی ڕاست و چەپیدا ڕوانی، لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئێستا من بۆ کوێ بڕۆم؟"

"دەبێ لە پرسگەکە چاوەڕێ بکەیت تاوەکوو دێن بەشوێنتدا!"

پەرستارەکە ئەمەی گوت و پاشان دەستی بە گۆڕینی پێخەفی سەر تەختی خەوەکە کرد، مەستوورە گەڕابووەوە ناو دەرگاکە و لێی ڕوانی، ویستی لێی بپرسێت: "لە پرسگەکە چاوەڕوانی کێ بکەم؟ کێ دێت بەشوێنمدا؟"

لەو کاتەدا پەرستارەکە بەسەر تەختی خەوەکەدا نووشتابووەوە و پشتی لەو بوو، پێش ئەوەی ئەو پرسیارەی لێ بکات، ژن و پیاوێک بەلای مەستوورەدا تێپەڕین، گوێی لێ بوو پیاوەکە بە ژنەکەی گوت: "ئێمە و ژیانی شاریان نەوتووە!"

دوای ئەوەی ئەمەی بیست، لەو خەیاڵەی دایانبڕی و سەرنجی چووە سەر ئەوان، لە پشتەوە لێی ڕوانین و بێدەنگ دوایان کەوت، تاوەکوو گەیشتنە ناو دەرگای دەرەوەی نەخۆشخانەکە، خۆی لێیان نزیک کردبووەوە و بەنیاز بوو هەمان پرسیاریش لەوان

بکات. پێش ئەوەی بگەنە پرسگەکە، چوو پێشی لە ژن و پیاوەکە گرت، بێ ئەوەی سڵاویان لێ بکات: "ئەرێ ئێوەش خەڵکی لادێن؟"

"خەڵکی لادێ بووین!"

پیاوەکە بەدەم پێکەنینەوە ئەمەی بە مەستوورە گوت و پاشان لە ژنەکەی تەنیشتی ڕوانی، دەستی خستە سەر دەستی ژنەکە: "توو خوا ڕێگام پیشان بدەن، بە خوا لێقەوماوم!"

"جا حاڵی گەلوگیپاڵی خۆمان زۆر جوانە، تاوەکوو یارمەتیی تۆمان پێ بدرێت!"

ژنەکە ئەمەی بە دەنگێکی تێکشکاوەوە گوت و دەستی کرد بە گریان، پیاوەکە دەستی مەستوورەی گرت و لە دەستی ژنەکەی کردەوە: "ئێمە جەرگمان سووتاوە و حەوسەڵەی هیچمان نییە."

مەستوورە لە خەیاڵی خۆیدا ویستی دڵنەواییان بداتەوە، لەو کاتەدا ژن و پیاوەکە بەلای ڕاست و چەپی ئەودا ڕۆیشتن، مەستوورەش بێدەنگ لە پشتەوە لێی ڕوانین. لە پرسگەی نەخۆشخانەکە دوو پۆلیس بە جلی سەوزەوە ڕاوەستابوون و لەگەڵ یەکتری دەدوان، بێ ئەوەی لێیان بڕوانن؛ بەلایاندا تێپەڕین. لە دەرەوەی پرسگەکە نزیکەی بیست کەسێک لە ژن و پیاوی بەتەمەن بەڕیز وەستابوون، مەستوورە تەنها سەرنجی لەسەر ژن و پیاوەکە بوو کە تاوەکوو ئەو کاتەش بەنیازی دڵنەواییدانەوەیان بوو. لە خەیاڵیدا لە خۆئامادەکردندا بوو. کاتێک ژن و پیاوەکە گەیشتنە بەردەم ڕیزێک تاکسی کە لەلای دەستەڕاستی نەخۆشخانەکەوە ڕاوەستابوون، ژمارەیان چوار تاکسی بوو. ئەوان چووبوونە ناو تاکسییەکە و هێشتا مەستوورە لێی

دەڕوانین، شۆفێرەکە پێش ئەوەی لێخوڕێت؛ لە مەستوورەی ڕوانی و پێی گوت: "سواری ئەو تاکسییەی دواوە ببە."

مەســـــتوورە لەو کاتەدا بە چواردەوری خۆیدا ڕوانیی و خێرا چووە ســەر شـۆستەکە، خۆی چەماندبووەوە و هێشـتا لە ژن و پیاوەکەی دەڕوانی، لەپشـتی تاکسـییەکەدا دانیشـتبوون و پێکەوە گفتوگۆیان بوو. دیســان هەنگاوێک لە تاکسـییەکە چووە پێشـەوە و خۆی دانـەواند و لـە ژن و پیـاوەکـەی ڕوانییەوە. دوای ئـەوەی تاکسـییەکە ڕۆیشـت و نائومێد بوو، بۆ پرسـگەی نەخۆشـخانەکە گەڕایەوە. پرســـگەکە ژوورێکی دوو مەتر چوارگۆشــــە بوو کە مێزێک و ســـێ کورســــیی تێدا بوو. یەکێک لە پۆلیســـەکان زەردەڵەیەکی بالابەرزی لاواز بوو، بێ ئەوەی لێی بڕوانێ، دەستی بەرەو ڕووی بەرز کردەوە: "دادە، بڕۆ! بڕۆ لە سەرەکەدا بوەستە!"

"کوڕە من ئێسـتا بەپێش چاوتاندا چوومە دەر، خێرتان دەگاتێ پێم بڵێن ئێرە کوێیە؟"

"جا ئەگەر تۆ نەزانیت ئێرە کوێیە، کەواتە تۆ تەندروسـتیت باش نییە!"

هەمان پۆلیس کاتێک ئەمەی بە مەســـتوورە گوت؛ لێی هاتبووە پێشەوە، ئەوەندە لێی نزیک بوو مەستوورە بۆنی هەناسەی دەکرد، بۆنی جگەرەی لێ دەهات. پۆلیســـەکەی تر کوڕێکی ڕەشــــتاڵەی کورتەبالا بوو، هات لە شــانی مەســتوورەوە ڕاوەســتا، لە بەری پێیەوە تاوەکوو چاوی چووە ســـەر چاوی؛ لێی ڕوانی، پێی گوت: "وەی وەی حەیاتم، تۆ لە لادێیی دەچیت!"

لای ڕاســت و چەپیان لێ گرتبوو، مەســتوورەش دەســتی لێک دەئالاند و بەســەرە لێی ڕوانین. پۆلیســە لاوازە بالابەرزەکە گوتی:

"دەی چی تۆی گەیاندووەتە ئێرە؟"

"قەزا و قەدەر! توو خوا ئێستا من بۆ کوێ بچم؟"

"ڕاستەوڕاست بچۆ بۆ دووکانی پێلاو فرۆشێک!"

پۆلیسە کورتەبالاکە ئەمەی گوت و دەستی بۆ جزمە شینەکانی پێی مەســتوورە درێژ کرد، کە هێشــتا ســەوزیی شــیاکەی مانگا و بزنەکانی پێوە دیار بوو. پۆلیســـــەکان پێکەوە قاقا پێدەکەنین، مەســتوورە خۆی لە نێوانیاندا دەرباز کرد و چوو لەناو دەرگاکەدا ڕاوەســتا، پشــتی کردە پۆلیســەکان و چووە دەرەوە و بەلای ئەو خەڵکەدا تێپەڕی کە لە ڕیزەکەدا ڕاوەســتابوون. کاتێک گەیشــتەوە لای تاکســـییەکان، دوو شـــوفێر پێکەوە لەســـەر شـــۆســـتەکە وەســـــتابوون و جگەرەیان دەکێشـــا و گفتوگۆیان بوو، بۆنی جگەرەکەیان هات بە ســـەریدا، ڕانەوەســـتا و بەلایاندا تێپەڕی، گەیشتە کۆتایی شەقامەکە و بەردەم چەند دووکانێک. لە دووکانی یەکەم کە ســـەوزەفرۆش بوو، کابرایەک لەناو دووکانەکەدا ڕاوەســـتابوو، تەمەنی پەنجا ســـاڵێک دەبوو، پێش ئەوەی بگاتە بەردەمی و ناو دووکانەکەی؛ لە دوورەوە لێی دەڕوانی. مەستوورە لەگەڵ گەیشـــتە ناو دووکانەکە و بەردەم کابرای دووکاندار، لێی پرسی: "لالە گیان، ئێرە کوێیە؟"

"جا خوشــکێ گیان قابیلە ئێرە کوێ بێ، تەرەف موســتەشــفەی جمهوورییە."

"موستەشفەی جمهووری؟"

"بەڵێ، ئا ئەوەتا موستەشفەکەمان لێوە دیارە!"

"ئێ باشە، ئێرە کوێیە؟"

"شاریعی موستەشفە، دەی مەگەر پێتم نەگوت!"

مەستوورە بە چواردەوری خۆیدا ڕوانیی، هەناسەیەکەی قووڵی هەڵکێشا: "لالۆ گیان من لێم قەوماوە، دوو ڕۆژ لەمەوبەر بەبێهۆشی هێناومیان بۆ ئەم موستەشفەیەی تۆ بە جمهووری ناوی دێنیت. لە کەسوکارم دابڕاوم و ئێستا نە دەزانم ئەوانیان بۆ کوێ بردووە، نە دەزانم خۆیشم لە کوێم. خێرت دەگات دەستگیرۆییم بکەیت!"

کاتێک مەستوورە ئەمەی بە کابرای سەوزەفرۆش گوت، کابرا عەلاگەیەکی گرت بە دەستیەوە و دوو سێو و پرتەقاڵێکی تێ کرد و دایە دەستی و پێی گوت: "دەی بڕۆ! بڕۆ دەی، ئەوەش لە خێر خوا!"

# ٤

کاتژمێر نۆی ڕۆژی پێنجشەممە بوو، دەمەوبەیانیی ئەو ڕۆژەی لە نەخۆشـــخانەی جمهووریی شـــاری کەرکووک دەرچووبوو. ڕووداوەکان ئەوەندە کاریگەرییان لەســـەر خەیاڵی هەبوو، نەیدەزانی چۆن بەسەرهاتی خۆی بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە، بەردەوام بەنیوەناچڵ و بەترسەوە پرسیاری لە ڕێبواران دەکرد، هەندێک بە قسەکانی پێکەنیبوون و پێیان گوتبوو: "دیارە تۆ تێک چوویت!"

هەموو ئەوانەی مەستوورە پرسیاری لێ کردبوون، دوای ئەوەی بەسەرنجەوە لێیان ڕوانیبوو، لێیان پرسیبوو: "تۆ لادێییت؟"

چەند جارێک بە بێزارییەوە وەڵامی دابوونەوە: "بەڵێ، بەڵێ لادێییم، دەی بە ناشکوریی خوا نەبێت دەبێ خەڵکی کوێ بم!"

شـــۆفێری تاکســـییەک بۆ بەرامبەر پردی خاســـە و بەردەم بارەگای حیزبی بەعسی بردبوو، کاتێک دادەبەزێت، شوفێرەکە پێی

گوتبوو: "ئەوانەی خەڵکی دێهاتە داگیراوەکانن و لە کەسوکاریان دابڕاون، هەموو دێن بۆ بەردەم ئەم بارەگایە!"

شۆفێری تاکسییەکە پیاوێکی کڵاوبەسەری تەمەن نزیک شەست ساڵ بوو، کاتێک مەستوورە بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، پێی دەڵێت: "ئافرەتێکی گەنجی وەکوو تۆ بڕۆیت لە کونێکدا سەری خۆت کز بکەیت، باشترە!"

مەستوورە لە وەڵامدا بەدەم گریانەوە: "لالە گیان، مادام لەو جێگایە سۆراغێکی کەسوکارم دەست دەکەوێت، ناچارم بڕۆم!"

"ئاگات لە خۆت بێت و هەروا بەئاسانی باوەڕ بەو سەگ و گورگانە نەکەیت!"

"سەگ و گورگ! کام سەگ و گورگ؟"

"مەبەستم لە جاش و پیاوەکانی حکومەتە!"

"ئێ... ئێ، دەی چی بکەم، ناچارم بڕۆم پرسیاری منداڵەکانمیان لێ بکەم."

مەستوورە کاتێک ئەمە بە شۆفێری تاکسییەکە دەڵێت، لە دابەزیندا شوفێرەکە دەڵێت: "من ناوم محەمەد عەبدوڵلایە و هەموو ڕۆژێک لەپێش موستەشفای جمهووری ڕادەوێستم، ئێهـ ئەگەر پێویستت بە یارمەتی هەبوو."

مەستوورە ئاوڕ بۆ شوفێرەکە دەداتەوە و سەری بۆ ڕادەوەشێنێت. کاتێک لەوبەر شەقامەکەوە لە پێش بارەگاکەی ڕوانی، بە درێژایی دیواری حەوشەی بارەگاکە ژنی ڕەشپۆش لە ڕیزدا وەستابوون. بارەگاکە بە ئاڵای ڕەنگاوڕەنگ ڕازابووەوە. مەستوورە لەو کاتەدا سەرنجی چووە سەر ئەو نووسینەی لەسەر

دیوارەکە نووسرابوو، ئەو دیوارەی ژنەکان لە پێشی ڕاوەستابوون کە زیاتر لە دوو سـەد مەتر درێژ بوو. بە درێژایی ئەو دیوارە، بەگەورەیی دوو وشە نووسرابوو: "بژیی سەرۆک!"

لەو ڕۆژەوەی کچەکانی ویستبوویان مەستوورە فێری خوێندنەوە و نووسین بکەن، ئیتر هەر نووسینێکی دەبینی؛ هەوڵی دەدا حونجەی بکات، بەلام ئەو ڕۆژە لە خەیاڵی خۆیدا دەڵێت: "جا ئەو نووسینە گەورەیە، کێ دەتوانێت بیخوێنێتەوە!" ریزی ژنە ڕەشپۆشەکان بەریان لە هەندێک پیتی گرتبوو.

لە جادەکە پەڕییەوە و چوو لە کۆتاییی شۆستەکە لە دوای ژنەکانەوە ڕاوەستا. دوو ژنی بالابەرزی گەنمرەنگ لە پێشییەوە بوون، کاتێک ئاوڕیان بۆ مەستوورە دایەوە، ئەویش بە سەرسوڕمانەوە لێی ڕوانین. پێش ئەوەی سلاویان لێ بکات، خێرا و بێ وەستان لێی پرسین: "بە سکێک لە دایک بوون؟"

هەردووکیان بە دەم پێکەنینەوە پێکەوە گوتیان: "بەڵێ... بەڵێ."

هەردوو خوشکەکە سێ خاڵی شینیان لەسەر چەناگەیان کوتابوو، گلێنەی چاویان گەورە و ڕەشێکی تۆخ بوو، چاویان ڕشتبوو. کاتێک لێت دەڕوانین، خێرا سەرنجت دەچووە سەر چاوە ڕەشەکانیان. لێویان تەڕ و لووتیان قنج، سەرپۆشی ڕەشی لەبەر خۆردا کاڵەوەبوویان بە سەردا دابوو، قژیان خاو و ڕەش لەژێر سەرپۆشەکانیانەوە بەسەر شانیاندا بلاو بووبووەوە: "من ناوم مینایە و ئەوەش گوڵەی خوشکم."

کاتێک یەکێک لە خوشکەکان ئەمەی بە مەستوورە گوت، ئەو لە ڕیزەکەی ڕوانی و نەیزانی کام لە دوو خوشـــکەکە ئەمەی گوت:

"ئێوە ناوتان مینا و گوڵەیە؟"

"بەڵێ. چی بۆ ئێرەی هاوردوویت؟"

"منیش وەکوو ئەو خەڵکە لێقەوماوە، بۆ سـۆراغی کەسـوکارم هاتووم!"

"خەڵک کوێیت؟"

"ئاوایی جەلەمۆرد، لە ناوچەی ناوشوان."

"ئێمەش خەڵکی دێی سماقین، ها لە گەرمیان، ناشـکوری نەبێت لەو ئاواییە بەتەنیا ئێمە دەرچووین!"

تاوەکوو ئەو کاتەش مەســـتوورە بە ســــەرنجەوە چاوی پێدا دەگێڕان و لەژێر لێوەوە و وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "مینا و گوڵە..."

یەکێک لە دوو خوشـــکەکە دەســـتی خســـتە ســـەر دەســـتی مەستوورە و لە چاوی ڕوانی و پێی گوت: "من ناوم مینایە!"

ئەوی تریان هاتە پێشەوە و سەر گۆی مەمکەکانی نووساند بە لاشانی مەستوورەوە و دەستی خستە سەر شانی: "منیش گوڵەم ناوە!"

مەستوورە لێیان ورد بووەوە، لەو کاتەدا مینا گوتی: "ئەوە ئێمە چەند ڕۆژێکە دێین بۆ بەردەم ئەم بارەگایە، خۆ نەمبینی یەکێک بچێتە ژوورەوە. ئەم ڕیزە هەتاوەکوو بێت درێژتر دەبێ!"

گوڵە لە مەستوورە هاتە پێش و بە گوێیدا چرپاندی: "دەڵێن بە فیڵ لێرە کۆمان دەکەنەوە، دوایی دەمانگرن و ئێمەش بە دەردی کەسوکارمان دەبەن!"

مەستوورە گرژومۆن بوو، بە سەرنجەوە لە گوڵەی ڕوانی: "چۆن! چۆن!"

مینا کە هێشتا دەستی لەسەر دەستی مەستوورە بوو، توند دەستی گوشی: "خوشکێ گیان، دەی لە تۆ وایە کەسوکارمانیان بۆ کوێ بردووە، دەڵێن بردوونیان بۆ بیابانێکی زۆر زۆر دوور!"

"کوێ! بیابانێکی دوور دوور؟"

"ئیتر ئەو خەڵکەی لە بۆردوومانەکاندا پێوە نەبوون و گیراون، بردوونیان بۆ ئەو جێگایە."

"کام جێگا؟"

"بیابانێکی دوور دوور!"

مینا ئەمەی گوت و گوڵە بۆی سەندەوە: "کوڕە بە خوا کەس نازانێت بۆ کوێیان بردوون، ئەو ڕۆژە ژنێک لێرە دەیگوت بردوونیان بۆ موجەمەع! ئا... ئا، موجەمەعێک لە بیاببانێکی دوور دوور."

مەستوورە بێدەنگ چاوی پێدا گێڕان، پاشان سەیری چواردەوری خۆی کرد و لەژێر لێوەوە گوتی: "موجەمەع لە بیابانێکی دوور دوور!"

"خوشکێ گیان، ئێمەش نازانین ئەو موجەمەعە چۆنە و لە کوێیە، لەوە دەچێت زیندانێکی گەورە بێت، یان ناوی شارێک یان

جێگایەکە، بەڵام هەموو کەس دەڵێن لە بیابانێکی دوور دوورە، مەگەر خوا بۆخۆی بزانێت چەند دوورە!"

"جا باشتر نییە ئێمەش بۆ لای کەسوکارمان بچین، ئیتر خوای دەکرد لە دۆزەخ دەبوون!"

"ئی بیابان وەک دۆزەخ وایە، خۆ دەڵێن کەس ناتوانێت لێی بژی!"

دوای ئەوەی مینا ئەمەی گوت، بێدەنگ لە یەکتریان ڕوانی، لەو کاتەدا هەرسێکیان سێکوچکەیەکیان دروست کردبوو، سنگیان نووساندبوو بە یەکەوە و بەچرپە دەدوان. لەدوای ئەوانەوە ڕیزەکە تا دەهات درێژتر دەبوو، مەستوورە تەنها ژن بوو کە لەنێوان هەمووواندا جلی ڕەشی لەبەردا نەبوو، ڕەنگی تۆخی جزمە و کراس و سەرپۆش و قژە سوورەکەی؛ کارێکیان کردبوو هەندێک لە ژنەکان لە ڕیزەکە دەهاتنە دەرەوە و لێیان دەڕوانی. گوڵە زوو زوو دەچووە سەر شەقامەکە و لە سەرەتا و کۆتایی ڕیزەکەی دەڕوانی، دەگەڕایەوە سەر شۆستەکە و خۆی لە مینا و مەستوورە نزیک دەکردەوە: "ئەمڕۆ سەرەمان بەر ناکەوێت!

"بڕۆینەوە و بەیانی زوو بێین باشترە." مینا وای گوت و لە مەستوورەی ڕوانی، ئەویش سەیری هەردووکیانی کرد: "چۆن؟ دەی ئێستا چی بکەین؟"

مینا دەستی مەستوورەی گرت: "خوشکێ گیان، تۆ لە ماڵی کێیت؟"

"ماڵ! ماڵی چی؟ لە موستەشفاوە بۆ ئێرە هاتووم!"

"دەی ئێستا بەنیازی کوێیت؟ قەومێک، ناسراوێک نییە بچیتە ماڵی؟"

"قوڕ بەسەر خۆم، ئا لێرە نارۆم تاوەکوو وەڵامێکم دەست نەکەوێت!"

کاتێک مەستوورە ئەمەی گوت، مینا و گوڵە بەسەرنجەوە لێیان ڕوانی، گوڵە دەستی خستە سەر شانی مەستوورە: "ئەوە ئێمە حەفتەیەکە هەموو ڕۆژێک دێینە ئێرە، ئیتر هەرچ کاتێک بێین زیاتر لە سەد کەسمان لە پێشەوەیە، بە خوا دادە گیان لەو ڕۆژەوە نەمبینی کەسێک ڕایی بکەن، کەچی ئەو خەڵکەش هەموو ڕۆژێک یەن. ئەوەتا بزانە ڕیزەکە گەیشتووەتە کوێ!"

مینا دەستی مەستوورەی ڕاکێشا و لە ڕیزەکە هێنایە دەرەوە، خۆی لێ نزیک کردەوە و بە چواردەوری خۆیدا ڕوانیی: "دەڵێن هەر ئەوەندی بزانن ئێمەش خەڵکی ئەو دێهاتە داگیراوانەین، ئیتر دەمانگرن و بۆ لای کەسوکارمان دەبەن."

"جا کوا خوا ئەوەی بکردایە، خۆزگە بەو قسەیەی تۆ دەبوو!"

مەستوورە کاتێک ئەمەی وەڵامی مینا دایەوە، هەردوو خوشکەکە بەسەرنجەوە لێیان ڕوانی، پاشان مینا بە گوێی مەستوورەدا چرپاندی: "دەی قوڕ بەسەر خۆمان و کەسوکارمان، جا مەگەر خوا بۆخۆی بزانێت ئەوان چییان لێ بەسەر هاتووە!"

"کێ وای وت، ها؟ بەڕاستی کێ وای پێ وتیت؟ قابیلە چییان لێ بەسەر هاتبێت!"

مەستوورە ئەمەی گوت، دوو خوشکەکە بەترسەوە بە چواردەوری خۆیاندا ڕوانییان، پاشان ڕاست و چەپیان لە

مەستوورە گرت و هەردووکیان قۆڵیان گرت و لە شەقامەکە پەڕینەوە. شەقامەکە زوو زوو ئۆتۆمبێلێک لە ڕاست یان چەپیەوە تێدەپەڕی. لەوبەر شەقامەکە و بەرامبەر ژنەکان وەستابوون، مەستوورە ئاوڕی دایەوە و لە ئەپارتمانەکە و ڕیزی ژنە ڕەشپۆشەکانی ڕوانی، لەبەر خۆیەوە و وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "ئینجا خوشکێ گیان خۆ بەمردووییش بێت، حەزم دەکرد لەگەڵ خدر و کچەکانمدا بوومایە!"

مینا دەستی لە قۆڵی مەستوورە کردەوە و پشتی تێ کردن و بەسەر شۆستەکەدا دەستی کرد بە ڕۆیشتن، بەبێ ئەوەی لە مەستوورە بڕوانێت، گوتی: "ئێ سبەینێ وەرەوە و لە پێشەوەی ڕیزەکەدا بۆخۆت بوەستە."

گوڵە دوای مینای خوشکی کەوت و پاشان لە شانیەوە ڕۆشت. مەستوورە هێشتا لە شوێنی خۆی وەستابوو، دیسان لە ڕیزی ژنە ڕەشپۆشەکانی ڕوانییەوە، هەنگاوێکی نا و چووە سەر شەقامەکە و پاشان بۆ سەر شۆستەکە گەڕایەوە، لە خەیاڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە کە بچێ لە ڕیزەکەدا بوەستێ، ئیتر بە هیچ لایەکدا نەڕوات تاوەکوو نۆرەی دێت، بێ نان و ئاو، بێ خەو، تا سۆراغێکی خدر و کچەکانی دەکات.

مینا و گوڵە پێکەوە گەڕابوونەوە بۆ لای و دەستیان خستە سەر شانی و لەو خەیاڵەی دایانبڕی، لەو کاتەدا مەستوورە لەبەر خۆیەوە گوتی: "دەچم لەو ڕیزەدا دەوەستم، ناڕۆم هەتاوەکوو نۆرەم نەیەت!"

"ئا ئەو ژنانە دەبینیت لە پێشـــەوەی ڕیزەکەدا گەڵ و قوزیان بەســەر ئەو شـۆسـتە ڕەقەدا پان کردووەتەوە، بە خوا وا بزانم شــەویش لەویا ڕۆژ دەکەنەوە، ئەوە لەو ڕۆژەوەی ئێمە بۆ ئێرە دێین، نەمانبینی ژنێک لەو دەرگایەوە بچێتە ژوورەوە."

"دەی ئێستا من قوڕی کوێ بە سەری خۆمدا بکەم!"

گوڵە قۆڵی کرد بە قۆڵی مەسـتوورەدا و بەسـەر شـۆستەکەدا پێکەوە کەوتنە ڕێ: "ئەرێ خوشکێ گیان خۆ سەری دنیا بە پووش نەگیراوە، ئێمە لە گەڕەکی عەرەبی شاری هەولێر ژوورمان بەکرێ گرتووە و تۆش وەرە و جێت دەکەینەوە!"

مینا لە دوایانەوە گوتی: "دەبێ لای خاوەنماڵەکە بڵێین کە تۆش قەومی ئێمەیت!"

"کوڕە ئاخر من چۆن دەستبەرداری خدر و کچەکانم ببم!"

"ئێ لە سـبەینێوە هەموو بەیانی زوویەک وەرە و بۆ خۆت لەو ڕیزەدا بوەستە!"

"دەی ئێوە بەنیازی چین؟"

کاتێک مەســـتوورە ئەمەی پێ گوتن، وەســـتابوو و ئاوڕی دابووەوە و بەســەرنجەوە لێی ڕوانین. گوڵە دەسـتی خستە سـەر شانی مەستوورە: "دەی ئەوە ئێمە چەندین ڕۆژە دێین و لە بەیانی تـاوەکوو ئێوارە لـەبـەر ئـەو خۆرەتـاوە بەوەســـتین، بێ ئـەوەی کەســـێک بێت و پێمان بڵێت ئەرێ ژنەکان ئێوە چ کارەن و بۆچی لێرەدا ڕیزتان بەسـتووە! کوڕە بە خوا کوڕی خاوەنماڵەکەمان پێی گوتین کـە بـە فێڵ لێرە کۆمـان دەکـەنـەوە و مـەگـەر خوا بۆخۆی بزانێت بۆ کوێمان دەبەن، ئیتر..."

مینا قســـەکەی بە گوڵە بڕی: "ئێ خۆ بە ناشـــکوریی خوا نەبێت شـۆڕەسـوارییان لێ ون نەکردووین، مێردێکی پیر و پەککەوتەمان هەبوو، خۆ ئەوە کەسوکارمان بۆ دەمێ ساڵە نەبینیوە!"

"ئەی منداڵ؟"

"کوڕە منداڵی چی! بە خوا کاتێک لەبریی خوێن داینیان بە شـێخ شەمسەدین، ئەوەندە پیر و پەککەوتە بوو کێری لێمان هەڵنەدەستا!"

کاتێک مینا ئەمەی گوت، هەردووکیان دەسـتیان کرد بە پێکەنین. مەســـتوورە لێی ڕوانین: "بۆ ئێوە هەوێی یەکن و هەردووکتان شووتان بە پیاوێک کردبوو؟"

"خۆ خوشـــکێ گیان ئێمە بە خواســـتی خۆمان شـــوومان پێ نەکردبوو، باوکم بەناچاری دابووینی بە شـێخ شـەمسـەدین. کاتێک حەیدەری برام لەسەر سەرەی ئاو دوو کوڕی شێخ شەمسەدینی کوشت، ئیتر کاتێک خوێنیان خۆش کرد، لەبریی خوێنی دوو کوڕە کوژراوەکە؛ ئێمەیان پێ دان، لەدوای ئەو ڕۆژەوە حەیدەر ســـەری خۆی هەڵگرت و هەر نەمانبینییەوە."

"بە خوا تاوەکوو ئەو دەمەوبەیانییەی ناو دێ تۆپباران کرا و سەربازەکان بۆ ناو دێ هاتن، ئێمە حاڵمان لە حاڵی سەگ خراپتر بوو. سـەربازەکان لەسـەر قەڵای شـاری کفرییەوە بیسـت تۆپیان زیاتر بەناو ئاوایی ســـماقییەوە ناوە، ئیتر مەگەر خوا بۆخۆی بزانێت چەند لە نارەحەتیدا بووین!"

گوڵە ئەمەی گوت و بە لچکی فەقیانەکەی؛ چاوە تەڕەکانی سـڕی. مەسـتوورە بێدەنگ لێی ڕوانین، پاشـان لە شـانی یەکەوە بەسەر شۆستە بەردڕێژکراوەکەی سەر پردی خاسەدا ڕۆیشتن.

مەستووره لەنێوان مینا و گوڵەدا بوو، هەرسێکیان بێدەنگ لە بەر پێی خۆیان دەڕوانی، دیار بوو هەرسێکیان بە خەیاڵ بۆ ڕۆژانی لادێ گەڕابوونەوە.

## ٥

مەســـتووره ئەو ڕۆژه لەگەڵ مینا و گوڵه له کەرکووکەوه بۆ هەولێر چووبوو، ئەوان له گەڕەکی عەرەب ژوورێکیان به کرێ گرتبوو، کاتێک گەیشـتبوونه بەردەم ماڵەکە، مەسـتوورەیان زیاتر له کاتژمێرێک له بەر دەرگادا ڕاگرتبوو، داوایان له خاوەنماڵ کردبوو که مەســـتووره بۆ هەفتەیەک له لایان بمێنێتەوه. مینا به خاوەنماڵەکەی گوتبوو گوایا مەســتووره زڕخوشــکیانه و مێرد و منداڵی گیراون. مینا و گوڵه بەڵێنی ئەوەیان به مەســـتووره دابوو که ڕۆژی دواتر بۆ بەردەم بارەگای حیزبی بەعســی بەرنەوه. مینا به مەسـتوورەی گوتبوو: "شـوکور ئیحتیاج و موحتاجی کەس نیین و ئەوەندەمان پاره پێیه تاوەکوو کرێی خانووەکه و بژێویی ژیانی خۆمانی پێ دابین بکەین." مەسـتووره لێیان دەڕوانێت و سـەریان بۆ ڕادەوەشێنێت.

ئەو شـــەوە مینا و گوڵە داوای ئەوە لە مەســـتوورە دەکەن کە لەگەڵ حەلیمەی خاوەنماڵ قســــە بکات، تاوەکوو ئەویش فێری قژبڕین بکات، مەستوورە لە مەبەستی ئەو قسەیە تێناگات و تەنها سـەریان بۆ ڕادەوەشـێنێت، پاشـان گوڵە لێی دەپرسێت: "خوشـکێ گیان، قەت ئەوەندە حاڵمان باش نەبووە، ئیتر خوای دەکرد ئەو مێردە پیر و پەککەوتەیەی ئێمە سەری بە بڕین دەچوو!"

خانووەکە ســێ هۆدە و هەیوانێکی گڵ دەبێ، خاوەنماڵ ژنێکی تەمەن حەفتا ساڵ و کوڕێکی تەمەن سی ساڵی دەبێ، بۆ قژ بڕین و خۆڕازاندنەوە لە زۆربەی گەڕەکەکانی هەولێرەوە ژنان ڕوو لە ماڵی حەلیمە دەکەن کە بە حەلیمە زێباری ناویان دەبرد. فارســی کوڕی ڕۆژانــە لە بــەر دەرگــای مــاڵــەکــەیــان دادەنیشـــێــت و مشـــتەرییەکانی بە ڕێ دەکرد. حەلیمە، هەر کەســێک ڕووی لە ماڵەکەی بکردایە، بەسەرهاتی خۆی بۆ دەگێڕایەوە، کە چۆن بیست ساڵ پێش ئەو ڕۆژە لە مووسڵەوە هاتوونەتە هەولێر، ئەو قسەیەی حەلیمە بەردەوام لەســـەر زمانی بوو: "ئەو ڕۆژەی موخەڕیبین حازمیان کوشت!"

لە دوای ئەم ڕستەیەوە هەڵوێستەیەکی دەکرد، پاشان بۆ کات و شوێن و باسێکی تر خەیاڵی دەڕۆیشت، لەوە زیاتر هیچی لەسەر کوشتنی حازمی مێردی نەدەگوت، بەڵام جارێک بە گوڵەی گوتبوو کە حازم حەرەس قەومی دەبێ و ســـاڵی ١٩٦٣ لە مووســـڵ دەکوژرێت. حەلیمە زێباری چیرۆکی کوشـــتنی حازمی مێردی بە چەندین جۆری جیاواز گێڕابووەوە.

مەستوورە ئەو شەوە لە سووچێکی ژوورەکەدا کزەڵەی کرد و زوو زوو لە پرمەی گریانی دەدا و یەک یەک ناوی کچەکانی دەبرد. ڕۆژی دواتر پێش خۆرکەوتن، گوڵە و مینای لە خەو هەستاند، داوای لێ کردن بۆ شاری کەرکووکی بەرنەوە. پێی گوتبوون: "دەبێ هەر چۆنێک بووە خۆم بگەیەنمە لای خدر و منداڵەکان، دەزانم ئێستا حاڵیان لە من خراپترە!"

کاتێک مەستوورە ئەمە دەڵێت، مینا لێی دەپرسێت: "خوشکێ گیان پەلەت چییە، خۆ ئەگەر لە موجەمەع بن، ئەوا لەوێن و دەیاندۆزیتەوە!"

"موجەمەع! جا دەبێ ئەوە لە کوێ بێت؟"

پاشان گوڵە و مینا تەنها سەر بۆ مەستوورە ڕادەوەشێنن و وەڵامی نادەنەوە. فارسی کوڕی حەلیمەی خاوەنماڵ پێیان دەڵێت: "بەردەم بارەگای یەرمووک لە گەڕەکی ئیسکان، هەموو ڕۆژێک پڕە لە ژن! وا بزانم ئەوانەی کەسوکاریان گیراون، هەموو دەچنە ئەو..."

مەستوورە قسەکەی پێ دەبڕێت و دەڵێت: "نا... نا، ئێمە دەبێت لە کەرکووک هەواڵی کەسوکارمان بپرسین!"

فارسی کوڕی حەلیمە بە مەستوورە پێدەکەنێت و پێی دەڵێت: "هەموو بارەگاکان هی یەک حیزبن و ئەویش ناوی حیزبی بەعسە، ئیتر لە کەرکووک بێت یان لە هەولێر. باوەڕ بکە لێرە بێت یان لەوێ، هەمان وەڵام وەردەگریتەوە!"

ئەو ڕۆژە مینا و گوڵە لەگەڵ مەســتوورەدا بۆ گەڕەکی ئیسـکان دەڕۆن، کاتێک دەگەنە ئەو گەڕەکە و بەردەم بارەگاکە، مەستوورە لە بارەگاکە دەڕوانێت، ئەپارتمانەکە هاوشێوەی ئەوەی کەرکووک دەبێ، ڕەنگ و دیوار و پەنجەرەکانی، ڕاســتە، دیوارێکی درێژ و هەمان نووسینی لەسەر نووسراوە: *"بژی سەرۆک"*

کاتێک مەستوورە ئەوە دەبینێت، ڕازی دەبێت.

ژنە ڕەشپۆشەکان لەبەردەم دەرگای ئەو بارەگایەشدا بەڕیز دانیشتبوون، زیاتر لە دوو سەد کەس دەبوون. لە شەقامەکە مینا و گوڵە ڕاســت و چەپیان لە مەســتوورە گرت و یەکێکیان دەستی خستە سەر شانی و ئەوی تریان دەستی گرتبوو، بە کۆرس پێیان گوت: "دەی ئێستا چی دەکەیت؟"

"ئیتر وەکوو ئەو خەڵکە!"

مینا و گوڵە لەســەر شۆســتەی بەرامبەر بارەگاکە ڕاوەستان، دەستیان بەرەو ڕووی ڕیزی ژنە ڕەشپۆشەکان درێژ کرد: "دەی بڕۆ بۆخۆت لەو ڕیزەدا بوەستە!"

"ئەی ئێوە بەنیازی چین؟"

مەستوورە کاتێک ئەمەی پێ گوتن، دەستیان لە یەک بەر دابوو، بەنیاز بوون لێک جیا ببنەوە. گوڵە لە مەســتوورە نزیک بووەوە: "ئیتر خوشکێ گیان، خۆت ڕێگای ماڵ دەدۆزیتەوە؟"

"ئەرێ."

بە دوودڵی و ترســەوە پشــتیان تێ دەکات و لە شــەقامەکە دەپەڕێتەوە. تاوەکوو دەمەوئێوارەی ئەو ڕۆژە لە ڕیزەکەدا بێدەنگ دادەنیشێت، لە پاش و پێشی ئەوەوە؛ ژنە ڕەشپۆشەکان

بەسەرهاتی خۆیان دەگێڕنەوە، مەستوورە زوو ئەوەی لەلا ئاشکرا بوو کە کەسیان خەڵکی دێهاتەکانی ناوچەی ناوشوان نەبوون. ئەو ڕۆژە مەستوورە قسەی لەگەڵ کەسدا نەکرد.

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کاتێک ویستبووی بڕوا، بە ڕێکەوت شێخ بایز دەبینێت کە لە ئۆتۆمبێلێک دادەبەزێت و خۆی بە بارەگای یەرمووکی حیزبی بەعسدا دەکات، بەڵام مەستوورە تەواو دڵنیا نابێت ئاخۆ ئەوە شێخ بایزی خەڵکی جەلەمۆرد بووە، ئەو بایز ناوەی پێش ئەوەی مەستوورە شوو بە خدری حاجی خاس بکات، حەزیان لە یەکتر کردبوو بیست ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە. تاوەکوو ئێوارەی ئەو ڕۆژە و پێش خۆرئاوابوون، لەبەردەم بارەگاکە چاوەڕوانی دەکات.

کاتێک شێخ بایز لە بارەگاکە دێتە دەرەوە، دوای چۆن و چاکی و هەواڵپرسین، شێخ بایز بە مەستوورە دەڵێت: "منیش وەکوو تۆ بۆ سۆراغی خەڵکی ئاوایی جەلەمۆرد و کەسوکارم بۆ ئەم بارەگایە هاتووم!"

کاتێک مەستوورە هەواڵەکەی پێ دەڵێت و بۆی باس دەکات چی ڕووی داوە، شێخ بایز لەسەر ئەو شەقامە و بە پێش چاوی ئەو ژنە ڕەشپۆشانەوە باوەش بە ملی مەستوورەدا دەکات و تاوێک بەسەر شانیدا فرمێسک دەڕێژێت.

کاتێک مەستوورە باسی ماڵی حەلیمە زێباری و گوڵە و مینای بۆ دەکات، شێخ بایز بە مەستوورە دەڵێت کە ئەو ماڵی خۆی لە هەولێر هەیە و ئێستا چۆڵە و کەسی تێدا نازی، پاشان کاتێک

سواری ئۆتۆمبێلەکەی شێخ بایز دەبن، بە مەستوورە دەڵێت حەز دەکەیت بە گوڵە و مینای هاوڕێت بڵێ با ئەوانیش بێن و لەو ئەپارتمانە بژین.

پاشان لە گەڕەکی ئیسکان و نزیک بارەگای یەرمووک، مەستوورە دەگەیەنێتە بەردەم باڵەخانەیەک. دەیباتە بەردەم ئەو ئەپارتمانە و سێ کلیلی بە پەتێکی سەوزەوە بۆ ڕادەگرێت: "ئەوە جێگا، بۆخۆت برۆ لێی بنوو. ماڵێکی تەواوە و هەموو پێداویستییەکی تێدایە."

## ٦

بێدەنگ لەناو دارمۆردەکاندا خۆمان شـــاردبووەوە، باوکم زوو زوو لەبەر خۆیەوە و بە چرپە: "فززەتان لێوە نەیەت!"

ئێمـە پێنج کـەس بووین و ترنجـابووینـە یـەکتری، بـەڵام لە چواردەورماندا گوێمان لە خشــــەخش بوو، بێجگە لە چرپەچرپی نزاکردن، دوایی لامان ئاشـــکرا بوو کە زیاتر لە دە ماڵی تر لەناو ئەو پەڵە دارمۆردەدا بووبوون. کاتێک گوێمان لە تەقەکان بوو، هەر لە بیســـتنی یەکەم گوللەوە، وەکوو ئازارێکی بەژانی هەبێت، لەتاواندا توند لێوی خۆی گەســـت، پاشـــان هەردوو دەســـتی بە دەمیەوە گرت، بەردەوام دەلەرزی و لەگەڵ بیستنی هەموو دەنگی گوللەیەکدا؛ نووزەیەکی لێوە دەهات. ئاگام لێی بوو باوکم ســــەر شـــانی دایکمی گرت و توند ڕایوەشـــاند، پاشـــان وا بزانم چەند جارێک لەهۆش خۆی چوو. ئەوەندە دەترسا، وتم دڵی دەوەستێت.

خۆ ئیتر ئەوە پیشــــەی دایکم بوو، زۆر لە تەقەکان دەترســـــا. سەربازەکان ئەوەند لێمانەوە نزیک بوون، گوێمان لە دەنگیان بوو، بەدەوری سنووری پەڵە دارمۆردەکەدا دەسووڕانەوە، من ئەوکات نەمدەزانی دەڵێن چی، چونکە بە زمانی عەرەبی گفتوگۆیان بوو. چەند جارێک تەقەیان بەناو پەڵە دارمۆردەکەدا کرد، دەنگی گوللەکان بەلای ڕاســت و چەپی ئێمەدا تێدەپەڕین، پاشــان چەند ســــەربازێک زیاتر لە دوو کاتژمێر لە نزیکمان دانیشــــتبوون و گفتوگۆیــان بوو، جگــەرەیــان دەکێشـــــا، چونکــە بۆنی دووکــەڵی جگەرەکەیانم هەست پێ دەکرد. لەو کاتەدا دایکم بەسەر ڕانی مندا بێهۆش کەوتبوو. کاتێک ئاگریان لە دارمۆردەکان بەر دا، دەنگی گوللــەکــان و قرچــەقرچی ســـــووتــانی پــەلی دارمۆردەکــان تێکــەڵ بووبوون. نــاو ســــییــەکــانم پڕ بووبوو لــە دووکــەڵی گــەڵای دارمۆردەکــان، بۆنێـک کە هەرگیز لێی تێر نەدەبووم. بــاوکم و براکانم دەم و لووتیان بە لچکی جامانەکانیان هەڵپێچابوو، بەڵام من و دایکم دەمێ بوو بە بۆنی دووکەڵی دارمۆرەکان ڕاهاتبووین. تایەر و سەرحەدی برام باوەشیان بە ڕانەکانی باوکمدا کردبوو.

تــاوەکوو دەمــەوبــەیــان و پێش خۆرکــەوتن لــەنــاو پــەڵــە دارمۆردەکاندا ماینەوە، چاوەڕوان بووین ئاخۆ کەی ئاگرەکە دەمانگاتێ و وەکوو قەدی دارمۆردەکان دەبینە خۆڵەمێش. بەڵام کاتێک چواردەورمان ڕووناک بووەوە و سەربازەکان ڕۆیشتبوون؛ هــاتینــە دەرەوە، بینیم زۆربــەی خــەڵکی ئــاوایی لــەنــاو پــەڵــە دارمۆردەکاندا بوون، کەس بەر گوللەکان نەکەوتبوو، هەروەها ئاگرەکە نەگەیشتبووە قووڵایی پەڵە دارمۆردەکان و کەس پەنجەی

گەرم نەبووبوو. ئێستاش لەو نهێنییە تێنەگەیشتم کە چۆن کەس بەر ئەو گوللەبارانە نەکەوتبوو! سەربازەکان لە هەر چوار لاوە ئاگریان بە دارمۆردەکانەوە نابوو، بەڵام ئەوەی ئەو شەوە لەناو ئەو چەند پەڵە دارمۆردەدا خۆی شاردبووەوە، لە مردن ڕزگاری بوو.

دایکم دەیگوت دارمۆردەکان پیرۆزن، چونکە هەموو ساڵێک کە سەربازەکان دێن؛ ئێمە دەپارێزن. خۆ ئەگەر ئەو دارمۆردەکان نەبوونایە، ئێمە دەمێ بوو قڕ بووبووین، کەچی هەندێک کەس پەڵە دارمۆردەکانیان دەبڕی یان دەیانسووتاندن.

کاتێک گەڕاینەوە ناو ئاوایی، بینیمان چی ڕووی داوە، سەربازەکان هیچیان لەگەڵ خۆیاندا نەبردبوو، بەڵام مەڕومالات و سەگ و تەنانەت پشیلەی ماڵەکانیشیان کوشتبوو، ئینجا گەوڕ و ماڵ و مزگەوتەکەیان ئاگر تێ بەر دابوو. بەبیرم دێت باوکم گوتی: "ئەوە یەکەمین جارە بە بیرەوەریی حەوت پشتم کە ببینم دوژمن بێتە سەر دێیەک و هیچ بەتاڵانی لەگەڵ خۆیاندا نەبەن. ئیتر دیارە دوژمنەکانیشمان بنیادەمێکی ترن!"

ماڵ و گەوڕ و کایەنەکانی ئێمە هێشتا گڕیان لێ هەڵدەستا، دوو سەگیان لەناو حەوشەکەماندا کوشتووە، سەگێکی ترمان لە نیوەشەودا وەکوو ئێمە بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، فیشەکێک بەر سمتی کەوتبوو. باوکم چارەی برینی سەگەکەی پێ نەکرا، تاوەکوو بۆخۆی بەدەم ئازارەوە تۆپی. ئاگام لێ بوو کە باوکم بەسەر کەلاکی سەگەکەدا دەگریا.

دەرگـای گـەوڕەکـان داخرابوون، ئـاگرەکـە کوڵـەکـەکـانی سووتاندبوون و بانیژەکە بەسەر مەڕ و بزنەکاندا ڕووخابوو. بینیم باوکم و براکانم دەیان بزن و مەڕیان بەزیندوویی لەژێر دار و پەردووی گەوڕەکـانـدا دەرهێنا کـە زۆربـەیـان موویـان هـەموو هەڵکڕووزابوو، هەندێکیان پێستیان ڕەش هەڵگەڕابوو، بۆکڕووزی خوری و گۆشـــت و بۆنی شـــیاکەی گەوڕەکان تێکەڵ بووبوون. بێجگە لە نەنکە شـەمسـە، کەس خوێن لە پەنجەی نەهاتبوو. گوێم لێیان بوو دوو پیاو باسـی ئەوەیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە کە چۆن نەنکە شەمسەیان کوشتووە، لەناو دووکەڵی کایەنەکەدا چاوم لێیان نەبوو کێ بوون و کامیان چیی گوت.

"ئەی خێرخوازێک نەبوو ئەو پیرێژنە لە ئاوایی دەرباز بکات؟"

"کوڕە برا، جا کێ دەیپەرژێتە ســـەر کێ! ئیتر ئەو قوڕبەســـەرە ئەو ڕۆژەی جەیش هاتبوون، نەیتوانیبوو بە پێی خۆی لە ئاوایی ڕابکات!"

"ئەی خوا بیانگرێت، جا پیرێژنێکی پەککەوتە چ زەرەرێکی لەوان دابوو!"

"لەسەر کارێزەکەی بەردێ بەڕووتی هەڵیانواسیبوو."

"ئەوە تەنها بۆ ئابڕووبردنی ئێمەیە."

"ئەی قابیلە دەبێ مەبەســــتیان چی بووبێت، بە خوا برا دە پیاومان لێ بکوژرایە و ئەوە ڕووی نەدایە. بە خوا پێم ناخۆش بوو!"

"وەڵڵا تاوەکوو خوا حەز کات نائینسانن!"

"کوڕە خۆ بەوەیشـــەوە نەوێســـتابوون، تێڵایەکیان لەو پیرێژنە بەستەزمانە بڕیبوو."

"دیارە زۆر ڕقلەدڵ بوون!"

"ئاخر برا پێم بڵێ لە چی؟"

"وەڵڵا نازانم! ئاخۆ دەبێ ئەوان لە چی ڕقلەدڵ بن!"

پاشـــــان پیاوەکان بێدەنگ بوون، من تەنها گوێم لە دەنگی بەرکەوتنی بەرد و دارە ســـووتاوەکان بوو کە دیار بوو پیاوەکان لەسەر مەڕوماڵاتە سووتاوەکان لایان دەبرد.

ئەو ماڵانەی لە ئاوایی؛ نوێن و زەخیرەیان بۆ دەرچووبوو، بۆ بەردەم مزگەتەکە بردنیان و پاشـــــان بەســـــەر خەڵکی ئاواییدا دابەشـــیان کردن. ژوور و بەرهەیوانەکەی ئێمە ســـــووتابوون و بەســـــەر یەکدا ڕووخابوون، هەر چییەکمان هەبوو بووبوون بە خۆڵەمێش، تاوەکوو چەند ڕۆژێکیش دایکم وەکوو شـێت بەناو دار و پەردووی سووتاوی ماڵەکەیدا چنگەکڕێی بوو.

تاوەکوو درەنگانی ئەو ڕۆژەش، هێشتا لە دوور گوێمان لە تەقە بوو. کاتێک خەڵکی ئاوایی هەموو گەڕابوونەوە، گوێم لێ بوو دەیانگوت: "ئەوە حەرەس قەومییەکان بوون!"

ئەوکات چەند جارێک ویســـتم پرســـیاریان لێ بکەم: "حەرەس قەومی چییە؟"

دەبێ مەبەســـتیان لە حەرەس قەومی چی بێت؟ داخۆ ئەوان دزن، دڕندەن، جەردەن یان پیاوکوژن؟

ئەو کاتە منداڵ بووم و ئەوەم نەپرســـی، بەڵام بە درێژایی ڕۆژگار لەو ناوە عەرەبییانە تێگەیشـــتم. ئیتر خۆ حەرەس قەومی

مەبەستیان لە سەربازەکانی دەوڵەت بوو، وەکوو هەموو سەربازەکانی پێشوو کە ساڵی جارێک یان دووان دەهاتنەوە، هەندێک جار لەنزیک ئاوایی بارەگایان دەخست، یان زوو زوو وەکوو شارەشەنگەسووره دەورووژان و هەرچ ڕۆحلەبەرێکیان وەپێش دەهات، چزەیان لێ هەڵدەستاند و ژەهری خۆیان تێ دەکرد. ئەو جەللادانە هەر جارە و ناوێکیان پێ دەوتن، منیش ئیتر بیرم لێ نەدەکردەوە و خێرا دەمزانی کە ئەوانە کێن و چ کارەن. بە درێژایی تەمەنم، زیاتر لە بیست جار لە ترسی ئەوان خۆمان لەناو ئەو چەند پەڵە دارمۆردانەدا شاردووەتەوە. کاتی خۆی کە منداڵ بووم، وام دەزانی دایکم تێک چووە؛ دەیگوت: "دارمۆردەکان پیرۆزن و زیاتر لە هەزار ساڵە دەمانپارێزن."

ڕاستی دەکرد، من لە ڕۆژێکدا باوەڕم بە قسەکانی دایکم هێنا کە ئەو لە ژیاندا نەمابوو، کاتێک خۆم بووبوومە دایک و لەگەڵ خدر و چوار کچەکەمدا لەناو پەڵە دارمۆردەکاندا خۆمان شاردبووەوە، لەو کاتەدا زوو زوو ئەو قسەیەی دایکم لە گوێکانمدا دەزرینگایەوە.

# ٧

لەتاو سەرئێشە، سەری لەسەر سەرینەکەی بۆ بەرز نەکرایەوە.
لەو کاتەدا کتە لە مەتبەخەکە مەنجەڵێکی فافۆنی لەسەر کەوانتەرەکەوە خستە خوارەوە، تاکسییەکانی سەر شەقامە شەست مەترییەکە دەستیان کرد بە هۆڕینلێدان، چاوی بە ئەستەم هەڵبڕی و لە زۆپاکەی ڕوانی و لە بەر خۆیەوە گوتی: "ئیتر کە بەخت ڕووی لە لێژی بوو، بۆ خۆتماڵوێران دەبیت، خوا تۆیش ببڕێت بۆ چ زۆپایەکیت!"

کتە هاتبووە بەردەم تەختی خەوەکەی و دەیمیاواند، مەستوورە زۆری لە خۆی کرد و بە ناڵەناڵ ڕاست بووەوە و لەسەر لێواری تەختی خەوکەی دانیشت. کاتێک قاچی پێدا شۆڕ کردەوە، کتە چەند جارێک پشتی بە پێکانیدا هێنا. بەردەوام بە دەستێکی، سەر سنگی خۆی دەشێلا. سەری هەڵبڕی و لە بنمیچی ژوورەکەی

ڕوانی و گوتی: "ڕزگارم نابێت، دیسان دەستمان کردەوە بە بینینەوەی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانە، وەکوو من ئەو کات و ساتانەم هەزار جار بە خەون نەبینیبێت!"

کتە لەو کاتەدا دەیمیاواند، لێی ڕوانی و پێی گوت: "کتە، تۆ شەوی چەند کاتژمێر دەخەویت؟"

کاتێک بۆ مەتبەخەکە بەڕێوە بوون، بەدەم ڕێگاوە بە کتەی گوت: "ئەگەر تۆش وەکوو من بەردەوام خەوی ناخۆشت دەبینی، خۆت لەم باڵەخانەیەوە هەڵدەدایە خوارەوە. وا بزانم تۆ دڵت لە بەردە و هیچت بە خەیاڵدا نایەت، دەزانم لە وەتەی پشیلەیت؛ تەنها خەیاڵت لای ورگتە!"

ترسی لە بینینی ئەو خەونەی، وەکوو ئارەقە بەسەر پێستی ناوچەوانیەوە نووسابوو. ئەو ئازارەی لە سنگیدا هەستی پێ دەکرد، هەناسەی پێ توند کردبوو. دیمەنی خەونەکەی بە ئەستەم و پچڕپچڕ دەهاتەوە یاد. بەلووعەی سەر سنگەکەی بەر دابووەوە و دەستە ئارەقاوییەکانی شۆرد. ڕۆژانە خووی پێوە گرتبوو کە دوای لە خەون ڕابوون، بەلووعەکەی بەر دەدایەوە و لە بەر خۆیەوە دەیگوت: "خوایە، لە بەڵا لامان دەیت!"

بەڵام ئەم جارەیان لە بەر خۆیەوە گوتی: "خوایە، لەم ژیانە پڕ چەرمەسەرییە ڕزگارم بکەیت."

هۆڕینی ئۆتۆمبێلەکان درێژەیان کێشا و لە مێشکیدا دەنگیان دەدایەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دەستی بە گوێکانیەوە گرت: "لەو ڕۆژە دەچێت کە کاروانی ئۆتۆمبێلی پیاوەکانی قاسم ئاغا بۆ ناو دێ دەهاتن، ئیتر خۆ ئەو پیاوچاکانە کاتێک دەگەیشتنە

ناو دێ، بەردەوام هۆڕینیان لێ دەدا و تەواوی مرۆڤ و گیانداری ئاواییان لە هاتنی خۆیان ئاگادار دەکردەوە! خۆ ئەوان تەنها بەوەوە نەدەوەستان و زوو زوو فیشەکیشیان دەتەقاند. ئای کە خەڵکی ئاوایی لە تەقەکان دەترسان، بەتایبەتی دایکم!"

مەستوورە هێشتا خەیاڵی لە ئاوایی جەلەمۆرد بوو. لە جامێکی باغەدا نانی بۆ کتە خووساند. وەکوو قسە لەگەڵ یەکێک بکات: "لەدوای ئەو ڕۆژەوە ئیتر دەردیسەری و خەم و خەفەت دەستی پێ کرد. خۆ ئەو ڕووداوانە چەند ساڵ پێش ئەمڕۆ بوون، بەڵام زۆر جار هەست دەکەم دوێنێ بووە. بە گوێرەی هەندێک خەونم بێت، سەردەمی منداڵیم ڕوویان داوە، ئیتر ئاوا پێیانەوە سەرقاڵم و تەواو ماندوویان کردووم. ئەوە ساڵانێکە من عەقڵ و هۆشم لە سەردا نەماوە، لە بیرکردنەوە لەو دەردیسەریانە زیاتر."

بەسەرنجەوە لە کتەی ڕوانی، کاتێک گوێی لێ بوو بەمڵچەملچ ئاوی ناو جامەکەی دەخواردەوە، چوو بەدیاریەوە چیچکەی کرد: "کتە، تۆ بوویتە هاوڕێی تەمەنم، هەر چەندە ئەبەد نەتتوانیوە تەنها بۆ جارێکیش چییە دڵنەواییم بدەیتەوە. داخۆ تۆ هەست بە ئازارەکانی من دەکەیت؟ دەزانیت ئەو شتانە لە خەیاڵمدا وەکوو خۆیان ماون!"

کتە سەری هەڵبڕی و بۆنی بە پشتی دەستیەوە کرد، ئەویش زەردەخەنەیەکی هێنایە سەر لێوەکانی و هەڵسایە سەر پێ و چوو لە بەر پەنجەرەی مەتبەخەکە ڕاوەستا: "نازانم، تۆ بڵێی ئەوە ڕاست بێت کە دەڵێن هەمووی لە چارەماندا نووسراوە! ئەو ڕووداوانە بەردەوام لە خەون و خەیاڵمدا دووبارە دەبنەوە. من باوەڕ ناکەم،

بەڵام جارێکیان مەجیدە شـــەلی دراوســـێمان ئاوای پێ گوتم: 'بە گوێرەی کات، ناخۆشـــییەکەنمان لەبیر دەچنەوە و وردە وردە کاڵ دەبنەوە.' قوڕ بەســـەر خۆم، خەون و ڕاســـتیم تێکەڵ بوون و بۆم لێک جیا ناکرێنەوە!'

توند لەسەر کراسەکەیەوە پێستی سەر سنگی گوشی، چاوی لە دوور بڕی و دیقەتی لەســـەر دیواری قەڵاتێ ڕاگرت، لەژێر لێوەوە گوتی: 'ئەوسا کچە بچووکەکەم تەمەنی شانزە ساڵان بوو، تەمەنی کچەکان یەکی دوو ســـــاڵیان نێوانە، تاوەکوو ئەو ڕۆژەش لە دێ ڕۆیشـــتین؛ کەس خوازبێنیی نەکردن، هەر چەندە لەپێش چاوی من جوانترین کچ بوون کە تاوەکوو ئێســـــتا بەو دوو چاوەم بینیبێتم، ئەوانیش وەکوو من و دایکم لەبەر چاوی خەڵکی ناشـــرین بوون، چونکە نەیاندەزانی ڕەنگ و ڕوویان بشـــــارنەوە. خدر هەموو جارێک پێی دەگوتین: 'کچەکان وەکوو تۆ و دایکت بێشـــەرمن!' خۆ باوکم و خدر و هەموو ئەوانەی ڕۆژێک ئێمەیان دیبێت، وایان پێ دەگوتین: 'ئێوە بێشــــەرمن!' نازانم بۆچی ئەو کچانەم لە شـــێوە و ڕەوشـــــتیاندا لە من و دایکم دەچوون، بێ ئەوەی من مۆجگاریم کردبن، هەرچواریان لە تەمەنی چواردە ســـاڵییاندا عاشـــق بوون! ڕۆژانە وەکوو پەپوولە بەناو دێدا دەگەڕان، لەناو ماڵەکەدا لەســـەر نووکی پێ ســـەمایان دەکرد و گۆرانییان دەگوت. ئەو گۆرانیگوتنە خوویەکی من و دایکم بوو کە بەمیراتی بۆ کچەکانی منیش بەجێ مابوو، ئەوەش قیسمەت و نسیبی خۆیان.'

دەســـــتی بە قەراغی کەوانتەرەکەیەوە گرتبوو، بە دەســـــتێکی بەلوعەکەی با دا و دەنگی دڵۆپەی ئاوی بەلوعەکەی بێدەنگ کرد،

پاشـان وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت؛ گوتی: "باش بەبیرم دێت ئەو ڕۆژەی شـووم بە خدر کرد، بەفرێکی زۆر باریبوو، بەو سـەرما و بەفر و بارانە شــاییمان کرد. بەس نەبوو ماڵمان لە دێیەکی تر نەبوو، هەردووکمان خەڵکی دێی جەلەمۆرد بووین. ئەوکات ماڵی خدری حـاجی خـاس تـازە لـە دێی دارەقووتـەوە بۆ جـەلـەمۆرد هاتبوون، دیوارمان بە دیواری ماڵی خدرەوە بوو، ئەگینا بەو تۆفانە نەدەگەیشتینە لای یەکتری. لەبەر بەفر، کەس لە دێهاتەکانی تری ناوشــوانەوە بۆ زەماوەندەکەمان نەهاتبوو. کوڕ و کچی دێ لە گەوڕەکەی ماڵی خدر شـایی و هەڵپەڕکێیان دەکرد. وەکوو خدر هەموو جارێک دەیگوت: 'ئەو ڕۆژەی شــووت بە من کرد، تۆفان بوو!' خدر ئەمەی پێ دەگوتم کاتێک شــەڕمان دەبوو، پاشــان بەردەوام دەبوو و دەیگوت: 'ئیتر خۆم دەمزانی عاقیبەتمان خێر نابێت.' قەت ئەوەم بە خەیاڵدا نەهاتووە و بڵێم خۆزگە شــووم بە خدر نەکردایە، ئەگەر خدر نەبووایە، کچەکانیش نەدەبوون."

مەستوورە دوای ئەوەی ئەمەی گوت، دەستی لە یەک هەڵگلۆفین و هەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشـا: "خدر ئەوسـا دەیگوت: 'بێجگە لە من، کەس نەدەهـاتە خوازبێنیت. نـاوی تۆ و دایکت خراپ لەنـاو خەڵکیدا زڕابوو، دەیـانگوت گوایـا ئێوە جـادووبـازن، ئیتر منیش بەزەییم پێتدا هاتەوە بۆیە هاتمە خوازبێنیت!'"

کاتێک ئەو قســەیەی خدری بیر کەوتەوە، تاوێک بێدەنگ بوو، وەکوو بیەوێت زیاتر بیر لەو ڕۆژانە بکاتەوە، پاشــان بەردەوام بوو و گوتی: "باوکیشم هەموو جارێک ئەو قسەیەی خدری دەکرد: 'ژن وەکوو مەڕوماڵاتەکەمان زەلیلن، دەبێ چاومان لێیان بێت و

بەزەییمان پێیاندا بێتەوە!' ئیتر منیش ئەوسا بەو بەزەییەی باوکم و خدر ڕازی بووم. ئێستاش لەو شووەم پەشیمان نیم، گرنگ ئەوە بوو من لەشی پیاوێکم لە ڕووناکیدا بەڕووتی بینی. ئیتر بە خدر ڕازی بووم، چونکە لە سایەی سەری ئەودا چوار جار بووم بە دایک."

جامە شینەکەی بەردەمی کتەی هەڵگرت و بۆ ژووری نووستنەکەی برد، لەسەر زەوییەکە داینا و خۆی لەسەر تەختی خەوەکەی دانیشت: "ئەوکات دایکم پێی گوتم کە جادووم لە خدر کردووە و ئەمڕۆ یان سبەی دێتە خوازبێنیت، بەبیرم دێت بە دایکمم گوت: 'ئەری کەست نەدۆزیوەتەوە لەو نابووتە گرگنە زیاتر!' وا بزانم ئەگەر باش ئەو کاتەم لەبیر مابێت چاوەڕوانی ئەوەم نەدەکرد، دایکم دەیزانی من عاشقی کێ بووبووم، ئەوسا خدری حاجی خاس شوان بوو، ئەوەی ڕاستی بێت کوڕێکی کورتەباڵا بوو کە لەپێش چاومدا وەکوو بزنێکی لاوازی گەڕ وا بوو. وا بزانم ئەوەشم بە دایکم گوت کە خۆزگەم دەخواست لەجیاتیی ناوی خدر، ناوی بایزم لە دەمی ببیستایە، بەڵام دایکم پێی گوتم: 'من بڕیار لە چارەنووسی تۆ دەدەم!' ئیتر دیار بوو جادووەکەی دایکم کاری خۆی کردبوو، مارەکردنم و گوێزانەوەم لە یەک ڕۆژدا بوو. باوکم پێی وا بوو تەنها خۆی ئەوەی دەزانی، شەوێک پێش خوازبێنیکردنم قژی گرتم و بەتەنیا بردمیە ژوورێک، دوای ئەوەی هەڕەشەی لێ کردم، پێی گوتم: 'سبەینێ شوو بە خدری حاجی خاس دەکەیت!' وا بزانم پریشکی جادووەکەی دایکم بەر باوکیشم کەوتبوو، منیش تەنها سەرم بۆ باوکم لەقاند، چونکە

ئەو شـــەوەی پێکەوە لەگەڵ خدر چووینە پەردەوە، بە کچە گەورەکەمەوە دووگیان بووم و ئیتر لەوەدا نەمابوو بتوانم ورگم بشارمەوە کە ئەوەش تەنها نهێنیی نێوان من و دایکم بوو."

سـەیری کتەی کرد و پێی گوت: "کتە، خۆ منیش هەموو جارێک ئاوا بە تۆ دەڵێم دەبێ بەزەییم پێتدا بێتەوە، چونکە گیاندارێکی بێدەسەلاتیت و نوقسان و زەلیلیت!"

گەڕایەوە مەتبەخەکە و نانێکی ڕەقی لە زەرفێک دەرهێنا و لەبەر بەلوعەکەدا تەڕی کرد، پاشـــان خســـتیە ســـەر کەوانتەرەکە و پەڕۆیەکی بە سـەریدا دا. ساردکەرەوەکەی تەنها سـەتڵێکی سـپی کەرەی تێدا بوو، دوای ئەوەی نانەکەی نەرم بووەوە، کەرەی پیا سـووی و نانەکەی پێچایەوە و گەڕایەوە و چوو لەســـەر قەراغی تەختی خەوەکەی دانیشـــت. کاتێک کتە هاتە ســـەر کۆشـــی و میاواندی، وەکوو بە بۆن لە دەســـتی مەسـتوورە بگەڕێت. ئەو بێدەنگ لە دەرەوەی دەڕوانی، پارچەیەک لە نانەکەی دەســتی بۆ پچڕی و کردی بە دەمیەوە و پێی گوت: "ئیتر ئەگەر تۆ بزانیت من نانی چەورم پێیە، ئەوەی خۆت ناخۆیت!"

کتەی لەباوەش گرت و چوو لەبەر پەنجەرەکەدا ڕاوەســـتا، لە خۆرەکـەی ڕوانی کـاتێـک لـە پـەنجـەرەی نهۆمی ســـێهـەمی باڵەخانەکەی بەرامبەریدا دیار بوو. بەیانیان خۆر بەســـەر باڵای باڵەخانەکانی ئیسـکاندا هەڵدەهات، پێش ئەوەی خۆی دەربکەوێت، ڕەنگە زەردەکەی دەگەیشـت. دیسـان وەکوو خوویەکی ڕۆژانەی، چاودێریی هەموو باڵەخانەکانی دەکرد. چاوی بەســـەر پەنجەرەی ئەپارتمانەکاندا گێڕا، لە باڵکۆنی ئەپارتمانێک ڕیزێک جلی خەت

خەت بە تەنافێکدا هەڵواسرابوون، ڕەنگی خەتی سەر جلەکان شین و ســـپی بوون کـە زیـاتر لـە بیجـامـە دەچوون. لـە بـاڵکۆنی ئەپارتمانێکی تر ســـەرپۆشـــی ڕەش بە تەناف و لێواری پەرژینی بـاڵکونـەکـەدا درابوون، بـە جۆرێـک بـەری ڕووونـاکییـان بۆ نـاو ژوورەوە گرتبوو. لە ئەپارتمانێکی نهۆمی سێ، چاوی چووە سـەر قوماشێک کە لەپێش چاوی ئەودا هاوشێوەی پەلکەزێڕینە بوو. بەو جۆرە یەک یەک چاوی بەسەر باڵەخانەکاندا دەگێڕا. چەند پەنجەرەیەک پەردەی ئەســـتووری ڕەشـــیان پێدا گیرابوو کە بە درێژایی ئەو ســـاڵانەی مەســـتوورە لەوێدا دەژیا، نەیبینی ڕۆژێک ئەو پەردانە لا بدرێن. لە پەنجەرەی ئەپارتمانێکدا چاوی چووە ســـەر پیاوێکی قژ و ڕیش درێژ، ســـەرتاپا ڕەشـــی پۆشـــیبوو، هەستێکی ناخۆشی تێ گەڕا و خێرا چەند هەنگاوێک هاتە دواوە، لەو کاتەدا کتە لە باوەشـــی بازی دایە خوار، ئەویش بەپەلە پەردەکانی دادایەوە.

## ٨

بەردەوام سـەرزەنشـتی خۆی دەکرد و لەژێر لێوەوە بۆڵەبۆڵی بوو، هەندێک جار پڕ بە دەســتی؛ قژی خۆی دەڕنی و بەڕقەوە ڕایدەکێشـا، بەری نەدەدا تاوەکوو چاوی بە فرمێسـک تەڕ دەبوو، پـاشـــان زوو زوو بـە خۆی دەگوت: "بـە نـاخێری گیـانم خۆم مۆجگاریی کچەکانم دەکرد، زوو زوو ئەوەم بە خدر و کچەکان دەگوت مـەگـەر بـە مردن؛ ئـەگینـا لێک جیـا نـابینـەوە، کـەچی بۆ سەرشکانێک ئاگام لە قوونی خۆم نەما و لێیان دابڕام! ئیتر نازانم، دەبێ بڵێم ئەوە بە ڕێکەوت بوو یان لە چارەماندا نووسرابوو!"

مەستوورە بێدەنگ بەناو ماڵەکەیدا دەگەڕا، ئەم خەیاڵەی هەموو ڕۆژێک و ئیتر بۆ سـاتێکی کورتیش بووایە دەگەڕایەوە سـەری، سـەرزەنشـتی خۆی دەکرد و فرمێسـکی دەڕشـت، پاشـان دوای تاوێک بێدەنگی، دەستی بە ژیانی ئەو ڕۆژەی دەکرد.

کاتێک شێوازی مینا و گوڵە هاتنەوە پێش چاوی؛ زەردەخەنەیەک هاتە سەر لێوی، کە ڕۆژی پێشوو بەمیوانی بۆ ماڵی مەستوورە هاتبوون، شێوازی خۆگۆڕینیان و ئەو سووراو و سپیاوەی کردبوویان. مینا بە مەستوورەی گوتبوو: "خەڵکی ئەو گەڕەکی ئیسکانەی زۆر ندیوبدین، گەورە و بچووک لێی دەڕوانین، وەکوو ژنی سفوریان نەدیبێت!"

کاتێک خەیاڵی لەلای مینا و گوڵە بوو، بەردەوام دەستی بە شانیدا دەهێنا، هەستی دەکرد شان و ملی کۆڵنجی کردبوو، زۆپاکەی داگیرساند و گلۆپی ژوورەکەی کوژاندەوە. ئەو خاولییە سەوزەی دابووی بەسەر لێواری تەختی نووستنەکەیدا، گرتی بە دەستیەوە و بۆ گەرماوەکەی چوو. کاتێک ویستی دەرگای گەرماوەکە دابخات، کتە خێرا خۆی بە ژووردا کرد، دەیمیاواند و بەدەوری قاچیدا دەسووڕایەوە و خۆی تێ هەڵدەسووی. خەریکی داکەندنی جلەکانی بوو، لە کتەی ڕوانی و پێی گوت: "کتە، تۆ کوێریت، ئەگینا دوودڵم لەوەی تۆش بەڕووتی بمبینیت!"

جلە کۆن و پواوەکەی بە مێخی سەر دیوارەکەدا هەڵواسی و بەڕووتی لەسەر سێپایەکی پلاستیکی سپی دانیشت، دەستی بەسەر پشتی کتەدا هێنا: "چییە، قەت ئاوا نەمبینیویت، ترس مووەکانتی ڕاست کردۆتەوە، لەوانەیە تۆش خەونت بینیبێت! هەستت بە چی کردووە؟ تۆ دەزانیت چی بەڕێوەیە، وەکوو خوویەکی بنەچەت سپڵە مەبە و بە منیشی بڵێ، دەزانم ناتوانین یەکتر بدوێنین. من چاکت دەناسم، تۆ ئەگەر هەستت بە شتێک کردبێت، پێتەوە دیارە."

کته چەند جارێک لەژێر دەستیدا خۆی ڕاپسکاند، کاتێک ئەو دەستی دایە و ویستی لەباوەشی بگرێت، میاواندی و نینۆکەکانی بە پێستی مەچەکیدا هێنا. مەستوورە قیژاندی، کتەش چوو لە سووچێکی گەرماوەکەوە وەکوو بزانێت هەڵەیەکی کردووە، کز خۆی گرمۆڵە کرد. مەستوورە جامێک ئاوی ساردی کرد بەسەر جێنینۆکەکانی کتەدا، پاشان هەڵسا و دەرگای گەرماوەکەی کردەوە. بە نیگایەکی پرسیارئامێزەوە لە کتەی ڕوانی، بە تووڕەییەوە پێی گوت: "دیسان تۆ ئازارت دام، ناحەقیت بەرامبەر کردم. بڕۆ دەرەوە، هەی سپڵە!"

کتە زۆر بەهێواشی میاواندی، تۆنی دەنگی بەئەستەم دەبیسترا، چوو پێستی پشتی ملی گرت و فڕێی دایە دەرەوەی گەرماوەکە و دەرگاکەی داخست، دوای ئەوە تاوێک بێدەنگ لە شوێنی خۆی وەستابوو، لە چوار خەتە ڕووشاوەکەی سەر مەچەکی ڕوانیی، پاشان دەرگاکەی کردەوە و چەند جارێک بانگی کرد: "کتە! کتە! کتە وەرە!"

بەڵام کتە نە دەنگی هەبوو نە ڕەنگ، زیاتر چاوەڕوانی نەکرد و دەرگاکەی داخست و چوو لەبەر ئاوێنە تەڵخ و کلسگرتووەکەیدا وەستا، لە ئاوێنەکەوە جێگا نینۆکەکانی کتەی بینی، وەکوو بە بینینی چاوی خۆی باوەڕی نەکردبێت و لە ئاوێنەکە بپرسێت ئاخۆ برینەکەی چەند قووڵە، پاشان ڕاست بەرامبەر ئاوێنەکە وەستا و لە سەر بۆ خوار لە جەستەی خۆی ڕوانی، دەستی هەڵبڕی و خستنیە ژێر مەمکەکانی: "وەکوو جاران قنج و قوتن."

دەستی بۆ سەر ورگ و سمتی هێنایە خوارەوە، پەنجەی دەستی ڕاستی خستە ناو تووکەبەرە ڕەشەکەی و سەری شۆڕ کردەوە: "سەیرم لێ دێت، دەبێ ئەوەش جادوو بێت! ئەوەتا لەشولارم وەکوو جارانە، لەو ڕۆژەوەی خدر و کچەکانیان لێ ون کردووم؛ هیچ نەگۆڕاوم!"

بە سەری پەنجەکانی؛ تووکەبەرە لوول و ڕەشەکەی لا دا و بە دوو پەنجەی؛ کلێنکسێکی سپیی خوێناویی لەناو لەشی دەرهێنا، بە نیگایەکی پرسیارئامێزەوە سەری با دا و گوتی: "لە نهێنیی ئەم خوێنە تێناگەم، دایکم گوتی هەر ئەو شەوە خوێنت دەبێ کە لەگەڵ خدر دەچیتە پەردەی بووک و زاوایەتییەوە، لەبەر ئەوەی خدر نەزانێت پەردەی کچێنیت داوە بە یەکێک لە پیاوەکانی قاسم ئاغا. ئەوەتانێ تاوەکوو ئەمڕۆش دایکم دێتە خەونم و پێم دەڵێت: 'خەتاکە لە تووە بوو، چونکە تۆ بۆ چەمی باوەرووشە بانگت کردبوون، ئەو پیاوانە وەک سەگی هەوشار بۆنی بۆگەنی ناوگەڵی تۆیان کردبوو، بۆنی خوێنی ناو دەرپێکەی تۆیان کردبوو، ئۆباڵی ئەو خەڵکە قوڕبەسەرە لە ئەستۆی تۆیە!' زۆر هەوڵم لەگەڵ شێخ بایز دا تاوەکوو ڕاستییەکانم پێ بڵێت، لێم پرسی: 'بایز، ئەو ڕۆژەی سەربازەکان لە چەمی باوەرووشە ئەو خەڵکەیان دۆزییەوە، تۆ شوێنەکەت پێ وتبوون و پێشڕەویت بۆ کردبوون؟' بایز لە وەڵامدا سوێندی بە گۆڕی باوکی خوارد و پێی گوتم: 'هەلیکۆپتەرەکان ئەو خەڵکەیان بینیبوو، زۆریی ئەو خەڵکە بووبووە هۆی ئەوەی ببینرێن.' زیاتر لە هەزار کەس لەو چەمەدا

بووین، تەنها من ڕزگارم بووە، بێجگە لە من؛ هەموویان تاوەکوو ئەمڕۆش بێسەروشوێنن!"

بێدەنگ شانەکانی هەڵبڕی و چاوی نووقاند، سەری هەڵبڕی و دەمی کردەوە، وەکوو بیەوێت پڕ بە قرگی هاوار بکات، بەڵام بێجگە لە دوو دڵۆپ فرمێسک کە گل بوونەوە و کەوتنە سەر پێستی ورگی، هیچی تر نەبوو. هێواش و لەژێر لێوەوە گوتی: "مەلا مستەفا کە ئەوسا مەلای ئاوایی جەلەمۆرد بوو، لەگەڵ دوو پیاوی تردا قورئانیان بەرەو ڕووی سەربازەکان برد، کەچی بێ هیچ قسەکردن و لێدوانێک؛ تەقەیان لێ کردن و ئەو دوو پیاوە لەوێدا کوژران و مەلا مستەفای قوڕبەسەریش بریندار بوو. جا تۆ بزانە ئەو خوانەناسانە گوێیان بە نزای ئەو پیاوانە نەدا، تەنانەت سەربازەکان نەیانهێشت ئەو خەڵکە قورئانەکان هەڵبگرنەوە! لەدوای دەنگی تەقاندنی فیشەکەکانەوە، من و کچەکانم تەندروستیمان زۆر خراپ بوو، وەکوو خدری مێردم دەیگوت: 'دەڵێی فیشەکەکان بەر سنگی ئێوە کەوتوون!' ئەو ڕاستی دەکرد، چونکە ئەو خەڵکە و تەنانەت سەربازەکانیش هەموو بەسەرنجەوە لە ئێمەیان ڕوانی!"

چاوی هەڵبڕیبوو، دەستێکی بە ڕووی ئاوێنەکەدا هێنا: "بەڵام دایکم ناحەقیی دەرحەق کردم، کاتێک دەیگوت: 'تۆ نازانیت عەشق چییە، ئیتر کامە لە پیاوەکانی قاسم ئاغا ڕوو لەم ئاواییە بکەن؛ تۆ چاوبڕکێیان لەگەڵ دەکەیت. ئەگەر چاوی باوکتت لێوە دیار نەبێت، هەموویان سواری خۆت دەکەیت!' هەروەها جارێک ئەوەم لێ بیست کە جادووی لێ کردووم و بە نسیبی یەکێک لە پیاوەکانی

قاسم ئاغا دەبم! خۆ ئیتر ئەوە ڕووی دا و بڕایەوە، خۆزگە دایکم تەنها ئەو کەتنەی پێ بدامایە، ئەوەتانێ بزانە چۆن ئەم بەلایەم لەکۆڵ نابێتەوە، ئەوە تەمەنێکە، لەو ڕۆژەوە تاوەکوو ئێستا من ڕۆژانە دڵۆپ دڵۆپ خوێنم لەبەر دەڕوات، دایکیشم لە ژیاندا نەماوە تاوەکوو لێی بپرسم ئاخۆ چ جادوویەکی لێ کردووم! دەی قەرزارم بیت، چۆن تووشی ئەم خەمەت کردم!"

دەموچاوی لە ئاوێنەکە نزیک کردبووەوە و گوتی: "تەنها قژم نەبێت کە تا بێت ڕەنگی سوور دەبێ، دەڵێی مووی تووکەبەرمە و خوێنی پیا ڕژاوە، زۆر جار مووی خۆم لەوەی کتە بۆ جیا ناکرێتەوە. دەموچاوم هێشتا چرچی تێ نەکەوتووە، تەنها پەڵەی قاوەیی کەوتوونەتە سەر پێستی ڕوومەتم. چاوم هەر ساڵە و ڕەنگێک دەنوێنێ."

لەسەر سێپا پلاستیکییەکە دانیشتبوو، بە دەستێکی ئاوی سەر گونجەکەی سارد و گەرم دەکرد. چەند جارێک سەری بەرز کردەوە و لە ئاوێنەکەدا سەیری چاوی خۆی کرد و گوتی: "زۆر چوومەتەوە سەر دایکم!"

پاشان سەری شۆڕ کردەوە و دیسان لە جێنینۆکەکانی کتەی ڕوانی: "ئیتر پشیلەیە و نابێت لێی بگرم، چونکە ئەو زەلیلە و دەبێ من بەزەییم پێیدا بێتەوە، ئەویش وەکوو من برینداره. ئەو بێویژدانە لەسەر جووتێک کۆتر، هەردوو چاوی ئەو گیانداره بەستەزمانەی دەرهێنابوو."

دەستی بەسەر ڕانیدا هێنا و هێواش لەژێر لێوەوە گوتی: "لە ناچاریدا شووم بە بایز کرد، ئەگەر لێقەومان و بێچێیی نەبووایە،

دوای خدر شووم بە هیچ پیاوێک نەدەکرد. ئەو ڕۆژە کە لەبەردەم بارەگای یەرمووک دوای زیاتر لە بیست ساڵ ڕێکەوتی شێخ بایزم کرد، بە ناخێری گیانم بۆچی دوای کەوتم! ئەوکات وام دەزانی ئەو پیاوی حکومەتە و هەوڵێکم بۆ دەدات و بە دیداری کچەکانم شاد دەبمەوە، کەچی چەند مانگێک دوای ئەوەی شـووم پێ کرد، ئیتر نەموێرا لەلای باسیان بکەم، ئەوەندەم لە شێخ بایز دەست کەوت کە لە سایەی سەری ئەوەوە خاوەنی ماڵی خۆمم، ئەوە چەند ساڵە بە پارەی ئەو دەژیم. سـاڵێک دوای ئەوەی شـووم پێ کردبوو، زانیم ژنی تری هەیە. بایز باوکی دوو کوڕ و کچێکە. کاتێک شووم بە بایز کرد، زۆر دزەگورگانە بوو، پێی گوتم نابێت کەس لێت ببیستێت کە پێشتر مێرد و منداڵت هەبووە، ئەو ڕۆژە مەلایەک و دوو پیاوی تری لەگەڵ خۆی هێنابوو. بەو جۆرە شـووم بە بایز کرد کە زۆر لە شـووی یەکەمم دەچوو، هەر چەندە هەردووکیان بەناچاری بوون. ڕۆژێک بارامی کوڕی شێخ بایز هاتە بەردەرگا و گوتی: 'بۆ لای باوکم هاتووم!' یەکەم جار زۆر ناخۆش وەڵامم دایەوە، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت کە ڕاسـت دەکات و بایز باوکیەتی. چی بکەم! تاوەکوو ئێسـتاش زوو زوو دێت و دڵی بە من زۆر دەکرێتەوە. بۆم دەرکەوت شـێخ بایزیش وەکوو من جەرگسـووتاو بوو، کوڕە گەورەکەی کاتی خۆی لەناو ماڵەکەی خۆیدا لەسەر پاشەڵی ئەو کوژرابوو!"

مەستوورە وەکوو بیەوێت شێوازی بارام بێنێتەوە پێش چاوی خۆی، سـەری شـۆڕ کردبووەوە و دەسـتی بە دەموچاویدا هێنا و بەردەوام بوو، گوتی: "بارام هەندێک نهێنیی شێخ بایزی باوکی لام

درکاند. لەدوای هاتنی بارامەوە، کاتێک قاوەی دەخواردەوە، لە کوپەکەیم دەڕوانی. شـــەوان کاتێک دەنووســـت، لەپی دەســـتیم دەخوێندەوە. بەقەدەر تووکی ســـــەری تاوانی کردبوو، دیار بوو نەیویست من پێی بزانم، بەڵام دەمزانی بایز کاتی خۆی بە درێژایی بیست ساڵ پیاوی قاسم ئاغا بوو، ئەو قاسم ئاغایەی منداڵەکانمی بۆ هەتاهەتایە لێ دابڕیم و بە درێژایی تەمەنم تووشـی ئەو خەمە گەورەیەی کردم. بێجگە لەوە، خۆیشـم خەونم پێوە بینی و لەگەڵ قاسـم ئاغای سـەرگەورەیدا بوو. ئەو ڕۆژەی لێرەدا لەسـەر دەم کەوتبوو، خوێن لە دەم و لووتی دەڕۆیشـــت، نەخۆش بوو، زۆر نـەخۆش بوو، پرســـیارم لێ کرد: 'بـایز، کـاتی ئـەوە هـاتووە ڕاستییەکانم پێ بڵێیت، تۆ لەو تاوانانەدا بەشدار بوویت؟ بەتایبەتی ئەوەم پێ بڵێ، داخۆ تۆ کاتی خۆی جەیش و جاشت بۆ ناو چەمی بابەرووشـــە هێنابوو؟' کەچی ئەو کەللەڕەقە دانی پێدا نەنا و ئیتر خوێنی خۆی بە ئەســـتۆی خۆی، دەزانم ئەو جۆرە پیاوانە بە مردنیش لە ڕەفتاری خۆیان پەشـیمان نابنەوە. بەڵام بایز هەموو جارێک کە من ئەو پرســـیارەم لێ دەکرد، زۆر بەکوڵ دەگریا. هەسـتم بەوە دەکرد کە زۆر دڵشـکاو بوو، ڕقێکی گەورەی لە دڵدا بوو، چەندین جار بەسەرخۆشی و بەدەم گریانەوە چیرۆکی خۆی ئاوا بۆ دەگێڕامەوە: 'ســـاڵی ١٩٦١ باوکم لە کەرکووک هەڵهات و بوو بە پێشـمەرگە. لەگەڵ دایکم و براکانم لە ماڵی باپیرەم بووین، تاوەکوو ســـاڵی ١٩٦٣ چاومان پێی نەکەوتەوە، مەبەســـتم ئەوەیە تـاوەکوو ئـەو ڕۆژەی هـەواڵیـان بۆ هێنـاین کـە تەرمەکەی لـە مەیتخانەی جمهووری بوو. هەر چەندە دایکم نەیهێشـــت ئێمە

لەگەڵی بچینە ژوورەوە، نازانم باش لەبیرم نەماوە... وا بزانم باپیرەم بوو کە لە چوونەژوورەوەدا ڕێگای لێ گرتین، تۆ بزانە دەبێ چەند بەزەلیلی کوشـــتبێتیان، چونکە تاوانی ئەوەیان بۆ دروســـت کردبوو گوایا لایەنگری حەرەس قەومییەکانە! بەڵام باپیرەم بەردەوام لەبەر خۆیەوە دەیگوت: 'کوڕی من خوێنی پاکە و قەت خیانەت لە مەملەکەتی خۆی ناکات!' لەدوای ئەو ڕۆژەوە، دایکم لە گریان و کڕووزانەوە زیاتر تاوەکوو مرد؛ هیچی ترمان لێ نەبیســت. هەمووی ســاڵێکی نەبرد دوای کوژرانی باوکم، دڵی وەســتا و مرد. دەزانیت مەســتوورە، کاتێک بیســتمان کە باوکمان بووە بە پێشــمەرگە، ئیتر لەگەڵ براکانمدا شــەو و ڕۆژ باســمان دەکرد، هەموو شـــەوێک خەونم پێوە دەبینی، یانی قەت ڕێکەوتی ئەوەم نەکرد باوکم بە تفەنگەوە ببینم، تاوەکوو ئەمڕۆ چاوی بۆ دەگێڕم. ئەگەر بە قســـەی باپیرەم و دایکم بێت، ئەوا چەند هاوڕێیەک بوختانیان بۆ باوکم هەڵبەستبوو تاوەکوو بەو دەردەیان برد.' ئەم بەسەرهاتەم چەند جارێک لە دەمی شێخ بایز بیستبوو، تەنها ئەوەندی بۆ دەگێڕامەوە و پاشان دەستی توند دەگرتم و بێ ئەوەی لە چاوم بڕوانێ، بەتووڕەییەوە لەبەر خۆیەوە دەیوت: 'غەدرێکی گەورەیان لە باوکم کرد!' شـــێخ بایز کاتێک لەگەڵ هاوڕێکانیدا عارەقیان دەخواردەوە و مەســـت دەبوو، بۆ لای من دەهات، دەمزانی نەیدەوێرا بۆ لای ژنەکەی تری بڕواتەوە، ئەو شەوانە بەمەستی حیکایەتی خۆی بۆ دەگێڕامەوە.'

دیسان لە ئاوێنەکەدا لە خۆی ڕوانییەوە، دەستی بە قژیدا هێنا، چاوی نووقاند و بێدەنگ خەیاڵی لای شـــێخ بایز و یادگارییەکانی

بوو. چەند جامێک ئاوی کرد بەسەر ڕانەکانیدا و پێستی ڕانی خۆی توند گوشی، ئەژنۆکانی لە سنگی نزیک کردەوە و پاژنەی پێی لە لەشی خۆی چەقاند، لە ئاوێنەکەدا لە چاوی خۆی دەڕوانی، زیاتر لە نیوکاتژمێر خۆی لەگەڵ سێپا پلاستیکییەکەی ژێریدا دەجوولاند. کاتێک هەڵسایە سەر پێ، دوو جام ئاوی ساردی بەسەر شانیدا کرد، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: "خۆ پێدەچێت کاریگەریی جادووەکەی دایکم بێت، کە تووشم بە تووشی شێخ بایزەوە بووە!"

پاشان وەکوو یادەوەرییەکی بیر کەوتبێتەوە، هەڵسا و خاولییەکەی لە ناوقەدیەوە ئالاند. هەرکە لە دەرگای گەرماوەکە چووە دەرەوە، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی ناو ماڵەکەی، بەتانییەکانی لەسەر تەختی خەوەکەی ڕێک کردنەوە، کترییەکەی پڕ کرد لە ئاو و زۆپاکەی داگیرساند، گەڕایەوە بەردەم ئاوێنەکە و قژی شانە کرد. چووە بەردەم کەنتۆری جلەکانی، وەکوو چۆن جاران خۆی بۆ هاتنی شێخ بایز ئامادە دەکرد، پەڕۆ خوێناوییەکانی کۆ کردەوە، لەگەڵ کلێنکسە لوولکراوە خوێناوییەکاندا، خستنیە زەرفێکی بۆرەوە. ئەو بیجامە و پانتۆلانەی پەڵەی سووری خوێنیان پێوە بوو، لەناو کەنتۆری جلەکانیدا قایمی کردن. بەسەر تەختی خەوەکەیدا خۆی شۆڕ کردەوە، لەو پەڵە خوێنانەی ڕوانی کە بە بەرگی دۆشەکەکەوە بواردبوویان.

# ٩

پەڕۆیەکی توند بە ناوچەوانیەوە بەستبوو، شوێنەواری تارمایی خەونێک؛ ترسی بەسەر تەواوی خەیاڵیدا کێشابوو. قسەکانی دایکی لەژێر لێوەوە دووبارە دەکردنەوە. کاتێک دەموچاوی شـــۆرد، ســـاردیی ئاوەکە ڕایچڵەکاند و لە خەیاڵی ئەو خەونەی دابڕی. دەســـتە تەڕەکانی بەســـەر ڕانەکانیدا ســـڕی و بە قۆڵی پاڵتۆکەی دەموچاوی وشـــک کردەوە، وەکوو بیەوێت خەونەکەی لە بیری خۆی بەرێتەوە، دیســـان لە قەلاتێی ڕوانی: "دیارە خەڵکی شـــاری هەولێر بە درێژایی ساڵ جەژنی مەولوود دەگێڕن!"

مەســـتوورە کاتێک ئەمەی گوت، ســـەدان کەس بە قەدپاڵی بەرزاییەکانی چواردەوری قەلاتێوە دیار بوون. دەنگی دەف و بانگخوێنەکان دەگەیشتنە گەڕەکی ئیسکان. کاتێک خۆر ئاوا دەبوو، لە دوورەوە وەکوو ڕیزە دارسنەوبەر دەهاتنە پێش چاوی. هەندێک

لە گەنجانی شـــار ناویان لەو ڕۆژە نابوو "ڕۆژی عاشـــقان"، بەڵام پیرەکان هێشـــتا بە ڕۆژی مەولوود یان ڕۆژی خێر و بەخشـــین ناویان دەبرد.

شـێخ بایز نهێنیی ڕۆژی مەولوود و ئێشـکگرتنی خەڵکی شـاری هەولێری بۆ مەســـتوورە باس کردبوو، ئەویش بە شـــێخ بایزی گوتبوو: "دەزانیت بایز، ئەم شارە جادوویان لێ کراوە!"

"جادوو... جادوو، کوڕە مەگەر تەڕەماشـیان لێ کرابێت، تۆ هەر خەیاڵت لەلای جادووبازییە، ئەم شـــارە پڕە لە خەڵکی ئیماندار و لەخواترس!"

دوای ئەوەی شـێخ بایز ئەمەی بە مەسـتوورە گوتبوو، ئەویش لەژێر لێوەوە و وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "مەولوود بێت یان ڕۆژی عاشقان، ئەو خەڵکە قوڕبەسەرە جادوویان لێ کراوە!"

دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، لـە کۆڵان و نێوان بـاڵەخـانـەکـانی ئیسـکاندا مەستوورە بەدوای کتەدا دەگەڕێت، تەنانەت لە ئیسـکانی کۆن بۆ ماڵی مەغدیدی کۆتربازیش دەچێت، ئەو پیاوەی ســـاڵێک پێش ئەو ڕۆژە؛ هەردوو چاوی کتە دەردێنێت. مەســـتوورە بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە بەدیاریەوە دەبێت، پاشـــان لە مەغدید تووڕە دەبێت و پشـیلەکەی بە برینداری و خوێنەوە لە دەست دەردێنێت، لەباوەشـــی دەگرێت و بۆ ماڵەوەی دەباتەوە. مەغدید گوتبووی گوایا دوو کۆتری تەقلەبازی گرانبەهای خواردووم. ماڵی مەغدید بەرامبەر بارەگای یەرمووک دەبێت. کاتێک پرسیاری پشیلەکەی لە

مەغدید دەکات، مەغدید توورە دەبێت و دەڵێت: "جا کوا دەمبینی، بە خودای تۆڵەی خۆمم لێ دەستاند!"

مەستوورە بۆ سۆراغی پشیلەکەی، پرسیاری لە هەموو کەس دەکرد. زوو زوو لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "تۆ بڵێی کەسێک پشیلەیەکی سووری کوێری دیبێت!" ئەو ڕۆژە بە ڕێکەوت ڕێگای دەکەوێتە ماڵی مامۆستا سوارە و خەدیجەی شاعیر. لەبەر باڵەخانەکەدا خەدیجەی شاعیر دەستی مەستوورە دەگرێت و بۆ ماڵی خۆیانی دەبات. خەیاڵی لای گەڕانی پشیلەکەی نامێنێت و بەدەم چای خواردنەوەوە چیرۆکی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوە، باسی ڕووداوەکانی دێی جەلەمۆردیان بۆ دەکات، پاشان مامۆستا سوارەی مێردی خەدیجەی شاعیر قسەکان بە مەستوورە دەبڕێت و دەڵێت: "ئەو ڕووداوانە نابێت قەت لەبیرمان بچنەوە، بەڕاستی کارەساتە، نابێت قەت لەبیرمان بچنەوە!"

مەستوورە دوای ئەوەی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، لە مامۆستا سوارەی ڕوانی و قسەکانی پێ بڕی و گوتی: "بە خوا ئیتر چی بکەین، ئەوەش چارەنووسی ئێمەیە!"

خەدیجەی شاعیر لە مەستوورەی ڕوانی و گوتی: "دەبێ ئێمە نەوە لەدوای نەوە ئەو چیرۆکە بگێڕینەوە، تاوەکوو ڕۆژێک دێت ئەو خەڵکە هۆشیان وەبەر خۆیاندا دێتەوە و لە ئازاری ئەوانی تر تێدەگەن و هەستی پێ دەکەن."

پێکەوە لە باڵکۆنەکە دانیشتبوون، بەدەم قسەکردنەوە لە قەلاتێیان دەڕوانی، مەستوورە لەژێر لێوەوە گوتی: "دیارە خەڵکی ئەم شارە جادوویان لێ کراوە!"

مامۆستا سواره و خەدیجەی ژنی بێدەنگ له مەستوورەیان ڕوانی و هیچیان نەگوت. پاش تاوێک بێدەنگی، دیسان مەستووره له ژن و مێردەکەی ڕوانی و گوتی: "پشیلەکەم ون بووه و نازانم بۆ کوێ چووه!"

مامۆستا سواره و خەدیجەی شاعیر بێدەنگ بوون، هێشتا سەرنجیان لەسەر ئەو خەڵکه بوو که به قەدپاڵی قەڵاتێدا هەڵزنابوون. مامۆستا سواره له مەستوورەی ڕوانی و پرسیی: "تۆ گوتت ئەو خەڵکەی لەدەوری قەڵان و مەولوودی دەگێڕن، گوایا جادوویان لێ کراوه؟"

"ئەیچۆن!"

خەدیجەی شاعیر قسەکەی به مەستووره بڕی و گوتی: "تۆ ڕاست دەکەیت، ئەو خەڵکه جادوویان لێ کراوه، خۆ لەوه زیاتر نییه!"

مەستووره سەری بۆ خەدیجەی شاعیر ڕاوەشاند و له ڕووشاویی سەر مەچەکی خۆی ڕوانی و لەبەر خۆیەوه گوتی: "ئەوەتانێ کته چنگێکی لێ دام و منیش لێی تووڕه بووم!"

"کێ؟ چۆن؟"

خەدیجەی شاعیر وەکوو له خەونێک ڕاپەڕیبێت، ئەمەی گوت و خۆی له مەستووره نزیک کردەوه و بەنزیک گوێیدا چرپاندی: "پێکێک شەراب ناخۆیتەوه؟"

"چی؟"

مامۆستا سواره که هێشتا له سەر قەڵاتێی دەڕوانی، لەبەر خۆیەوه گوتی: "کته!"

پاشان خەدیجەی شاعیر دەستی بەسەر ڕووشاوییەکەی سەر مەچەکی مەستوورەدا هێنا و لێی پرسی: "ئەو جێ ڕووشاوییە؟"

مامۆستا سوارە وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت، بەبێ ئەوەی لێیان بڕوانێت: "گوتت گوایا پشیلەکەت کوێر بوو؟"

مەستوورە وەکوو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، هەڵسایە سەر پێ و لە خوارەوەی باڵەخانەکەی ڕوانی و بانگی لە کتە کرد، ئاوڕی دایەوە و لە مامۆستا سوارە و خەدیجەی شاعیری ڕوانی و پێی گوتن: "بەڵێ، چاوەکانی کوێر بوون. خۆزگە ئێوەش چاوتان بۆ دەگێڕام، کتە پشیلەیەکی نێری سووری گوڕپەیە."

## ١٠

بینینی خەون و ئاڵۆزیی خەیاڵەکانی، زوو زوو ونبوونی کتەیان لەبیر دەبردەوە. دیمەنی چەند ڕووداوێک، بەردەوام لە خەیاڵیدا دووبارە دەبوونەوە. دەیزانی بۆچی دەڵێت ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژە ڕەنگیان سوورە، یان بۆچی ئەو ڕۆژە ئەوەندە کاریگەریی لەسەر ڕۆحی ئەو بە جێ هێشتووە کە هەندێک جار بە ترسەوە بیری لێ دەکردەوە.

دیسان وەکوو هەموو جارەکانی تر، لەژێر لێوەوە گوتی: "دایکم ئەو ڕۆژە..."

قسەکەی تەواو نەکرد و چاوی پڕ بوو لە فرمێسک، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بۆ سەر تەختی خەوەکەی گەڕایەوە، پاشان بێدەنگ کاتژمێرێک لە خەیاڵی خۆیدا بەسەر یادەوەرییەکانیدا گەڕا. ئەو ساتانەی لەگەڵ دایکیدا بەسەری بردبوون، وەکوو هەموو

جارێک لە دەرگای یادەوەریی هیچ ساتێکی تری نەدا و بە خەیاڵ تەنها گەڕایەوە بۆ ئەو ڕۆژە: "دوو ڕۆژ پێش ڕاوی ئاسکەکان، من و دایکم پەتایەکی گرانمان گرتبوو..."

وەکوو ئێستاش هەست بە گەرمیی لەشی و داهێزرانی ئەو پەتایە بکات، پشتییەکانی لەسەر یەکتر دانان و پاڵی پێوە دان و گوتی: "ئەو شەو و ڕۆژانە باوکم و دوو براکەم و پیاوانی دێ لە ڕاو بوون، من و دایکم تایەکی گەرممان لێ هاتبوو، چەند جارێک ڕشاینەوە و بێدەنگ لە تەنیشتی یەکەوە ڕاکشابووین. دەمەوبەیانیی ئەو ڕۆژەی یەکێک لە براکانم لە خەو بەخەبەریان هێناین، دیار بوو پیاوانی ئاوایی جەلەمۆرد لە ڕاو گەڕابوونەوە کە باوکم و براکانیشم لەگەڵیاندا چووبوون، کاتێک من چوومە بەرهەیوانەکە، لە حەوشەکەم ڕوانی، بینیم چەند پیاوێک چوار سێکوچکەی داری مەشکەژەنینیان دانابوو، باوکم لەو کاتەدا لەسەر بارگیرێک کەلاکی سەربڕاوی ئاسکێکی دادەگرت، لە بەرماڵەکەم ڕوانی و بینیم کەلاکی سێ ئاسکی تر بەسەر پشتی بارگیرەکانەوە بوون. دایکم هات و بە دوو هەنگاو لەپێش منەوە و لەسەر پلیکانەکان دانیشت و لێی ڕوانین، لچکی فەقیانەکەی بە دەمیەوە گرتبوو، لەو کاتەدا دەگریا و زوو زوو شانەکانی هەڵدەتەکاند و گوێم لە نووزەنووزی بوو. باوکم بێ ئەوەی لە دایکم بڕوانێ: 'ژنەکە، ئەو تەشت و مەنجەڵانە بێنە با گۆشتەکەی تێ بکەین!' بێ ئەوەی وەڵامی باوکم بداتەوە، دایکم هەڵسا و بەلای مندا بۆ ژوورەوە چوو. کاتێک بە دوو تەشتی فافۆنەوە گەڕایەوە، بەرەو ڕووی من دەستی ڕاگرت: 'مەستوورە، بیانبە بۆ باوکت.'

کاتێک لە دایکمم ڕوانی، بینیم چاوی پڕ بوو لە فرمێسک و سەر ڕوومەتی تەڕ بوون. سەرم بۆ دایکم ڕاوەشاند و بە لایدا بۆ ژوورەوە ڕامکرد، چووم بۆ دیوەخانەکە و لەبەر پەنجەرەکەدا دانیشتم کە بەسەر حەوشەکەدا دەیڕوانی. لەو کاتەدا هەموو دانیشتووانی دێ لە حەوشەکەی ئێمەدا بوون، منداڵ و ژنەکان هاتبوون و چواردەوری سێکوچکەکانیان دابوو، ژنەکان بەپێوە و منداڵەکانیش لە بەردەمیاندا دانیشتبوون. پیرێژنێک بە دوو مەنجەڵی گەورەوە لە دەرگای حەوشەکەوە هاتە ژوورەوە، ئەو مەنجەڵانەی منداڵیان تێدا دەشۆرد، لەو کاتەدا یەکێک لە ئاسکەکانیان بە گوریسێک بە سمەکانی هەڵواسیبوو، ئەوەندە قەڵەو بوو، بە دوو پیاو گوریسەکەیان ڕادەکێشا و هەڵیاندەبڕی. دایکمم لە شانی باوکمەوە بینی، تەشتەکانی لەنێوان سێکوچکەکاندا دانا و خێرا بەناو ئەو خەڵکەدا بە پلیکانەکاندا بۆ سەرەوە گەڕایەوە، چووبوو لەسەر دوا پلەی پلیکانەکان دانیشتبوو، وەکوو جاری پێشوو لچکی فەقیانەکەی بە دەم و لووتیەوە گرتبوو. پیاوەکان یەک یەک کەلاکی ئاسکەکانیان لە پشتی بارگیرەکان داگرت و بە سێکوچکە دارەکاندا هەڵیانواسین. مام سەلام کە مجێوری مزگەوتی دێی جەلەمۆرد بوو، دوو چەقۆ و هەسانێکی بەردی ڕەشی بە دەستەوە بوو، چەقۆیەکی لە بنباڵی نابوو، ئەوی تریانی تیژ دەکردەوە. مەلا مستەفاش لە کەنارەوە وەستابوو لە مام سەلامی دەڕوانی. لەبەردەم ماڵی ئێمە، دوو ژن ئاگریان کردەوە و سێپیا و مەنجەڵی پڕ لە ئاویان خستە سەر ئاگردانەکان. قرچەقرچی چیلکە و دارە تەڕەکانم دەبیست. سووتانی دارە

تەڕەکان؛ بۆنی گەڵای مۆردیان لێ دەهات، بۆنێک کە زۆر حەزم لێی بوو، چونکە ساڵانە چەند ڕۆژێک دەچووین بۆ گەڵا و بەری دارمۆرد چنین. کاتێک لە چڵ و گەڵای دارمۆردەکان ئاگرمان دەکردەوە، لەگەڵ دایکمدا دەچووین سەرمان بەسەر ئاگرەکەدا ڕادەگرت، تاوەکوو سییەکانمان لە بۆنی سووتاوی گەڵای مۆردی پیرۆز پڕ دەبوون، پاشان ئەو ڕۆژەمان بەمەستی بەڕێ دەکرد. بە درێژایی ئەو ڕۆژە و تاوەکوو شەو درەنگ، پێدەکەنیین. کاتێک من لە ئاگرەکەم ڕوانی؛ بۆنم دەکرد، بۆنی سووتانی گەڵای مۆرد کە تاوەکوو ژوورەوە گەیشتبوو. دایکم هاتبوو لەلامەوە دانیشتبوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: 'تۆ بڵێی هەردووکمان بە خواردنی بەری دارمۆرد، نەخۆش نەکەوتبین؟' وەڵامی دایکم نەدایەوە، چونکە دایکم پێی وا بوو هەموو دارمۆردەکانی ناوشوان ژەهراوی کراون. پاشان بێ ئەوەی لێی بڕوانم، دەستم بەرەو ڕووی حەوشەکە درێژ کرد: 'ئای... ئای، تۆ بڕوانە چۆن سکی ئەو ئاسکەیان هەڵدڕی!' لەو کاتەدا مام سەلام پێستی ورگی ئاسکێکی لەنێوان گوانەکانیەوە تاوەکوو بەر ملی هەڵدڕی. ئاسکەکە خوێنی لێ دەچۆڕا. مام سەلام کاتێک چەند نووکەچەقۆیەکی لە ورگی ئاسکەکە دا، ڕیخۆڵەی پێچاوپێچ و کیسەیەکی سپی کەوتە ناو تەشتە خوێنەکە، پاشان مام سەلام دانەوییەوە و بە نووکی چەقۆکەی؛ کیسە سپییەکەی دڕی، دەستی کرد بەناو کیسەکەدا و کاتێک هەڵسایە سەر پێ، چوار پەلی کارژەلەیەکی زەردەڵەی خویناویی بە دەستەوە بوو، دەستی هەڵبڕی و بەدەوری خۆیدا خولایەوە و پیشانی خەڵکەکەی دەدا. وا بزانم بێجگە لە من و دایکم

و مام سەلام کە دەستی گیرابوو، تەواوی ئەو خەڵکە دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان. مەلا مستەفاش دەستی بەرز کردبوونەوە و لەبەر خۆیەوە نزای دەخوێند. من چاوم لەسەر کارژەلەکەی دەستی مام سەلام بوو، لەناکاو باوکم و دوو پیاو لوولەی تفەنگەکانیان کردە حەوا و چەند فیشەکێکیان تەقاند. هەر ئەوەندی گوێمان لە تەقەکان بوو، دایکم زریکەیەکی کرد، وەکوو ئەو فیشەکانە بەر جەستەی ئەو کەوتبن. من زیاتر لە دەنگی دایکم داچڵەکیم، بینیم دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو، پێڵووی چاوی خوێنیان تێ زابوو، دەستی توند لە مەچەکی من هەڵپێکا، پێکانی لە تەختەی سەر پەنجەرەکە گیر کردبوو، لێوی دەگەست و هەموو گیانی دەلەرزی، هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو. دووبارە گوێمان لە تەقەی چەند فیشەکێکی تر بوو، پاشان دایکم نووزەیەکی لێوە هات و لەسەرلا کەوتە سەر ڕانم، دەستی لە مەچەکم بەر دا، جێگای نینۆکەکانی خوێنیان لێ هێنابووم، کەفێکی سپی بەسەر لێوە سوورەکانیەوە بوو. هەوڵم دا ڕانم لەژێر لاشەی قورسی دایکمدا دەربێنم و بچم باوکم یان براکانم ئاگادار بکەمەوە، بەڵام چونکە هەردووکمان لەناو ڕەفەی پەنجەرەکەدا دانیشتبووین، هەر چەند هەوڵم دا نەمتوانی لەژێر جەستەی گرانی دایکمدا خۆم ڕزگار بکەم. ئەگەر باش لەبیرم مابێت، وا بزانم لەو کاتەدا تەنها بەسەر دایکمدا دەگریام، زوو زووش بە لچکی فەقیانەکانم؛ فرمێسکەکانی خۆم و کەفی لێوی ئەوم پێ دەسڕی.

مەستوورە خۆی ڕاست کردەوە و لەسەر تەختی خەوەکەی دانیشت، لەپی دەستی هێنا بە دەموچاویدا، لەو خەیاڵەی دابڕابوو،

چاوی نووقاند و دیسان ویستی به خەیاڵ بگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژە، سەری شۆڕ کردبووەوە و لە کۆشی ڕوانی، لەژێر لێوەوە و بە دەنگێکی تێکشکاو گوتی: "دووان لە ئاسکەکان دووگیان بوون و کارژەلەیان لە سکدا بوو!"

دوای ئەوەی هەناسەیەکی هەڵکێشا و نووزەیەکی لێوە هات، وەکوو خەم و ئازاری ناو ڕۆحی خۆی لەگەڵ دیمەنی ئاسکەکان بەراورد کردبێت، یان خەمی دایکایەتیی خۆی لە بینینی زەلیلی ئاسکەکاندا جارێکی تر هەست پێ کردبێتەوە. هەر چەندە لە ڕابردوودا وەکوو دایکێک هەندێک جار ئێرەیی بە ئاسکەکان بردبوو، وەکوو چۆن بە هەستی مرۆڤانەی چەندین ساڵە؛ ئازاری دووری و لێکدابڕان دەچێژێت. مەستوورە پێی وا بوو لێکچوونێک لەنێوان خۆی و ئەو ئاسکە کوژراوانەدا هەبوو، لێکچوونێک کە پیاوەکان ڕووی لوولەی تفەنگەکانیان لە هەر جێیەک بکەن، فیشەکەکان بەر جەستەی ژنێک یان دایکێک دەکەوێت، شریخەی تفەنگەکان ڕۆحی ناسکی ئەوان بریندار دەکات.

مەستوورە بەدەم گریانەوە بەردەوام بوو و گوتی: "یەکێک لە ئاسکەکان دووانەی لە سکدا بوو، دوایی من ئەوەم بیست کە ئەو کارژەلانە پاداشتی ڕاوچییەکان بوون. ژنانی دێ بە مەنجەڵ و قووڵینەوە دەوریان لە مام سەلام دابوو، کە یەک یەک پێستی لە بەری ئاسکەکان دادەماڵی. پێستە و کەللەسەر و ڕیخۆڵە و گۆشت و ئێسقانەکانیان بەسەر خەڵکی ئاواییدا دابەش کرد. کاتێک سێکوچکە دارەکانیان کۆ کردەوە، لەو کاتەدا دایکم هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و پێش ئەوەی چاوی هەڵبڕێت، دایە پرمەی گریان.

ئەوەندە بە دەنگی بەرز و کەساسی دەگریا، وام دەزانی لە کۆلان گوێیان لە دەنگیەتی، چونکە خەڵکی دێ لەو کاتەدا هەموو بۆ بەردەم ماڵی ئێمە هاتبوون. دایکم نەیدەتوانی لەو گریانەی ژێر بێتەوە. لەبەر ماڵەکاندا دەســـت کرا بە دەهۆڵ و زورنا لێدان، لە گوێمدا دەنگی گریانی دایکم و دەهۆڵ و زوڕناکە تێکەڵ بووبوون. دایکم وەکوو دەهۆڵ و زوڕناکە ســـەرنجیان ڕاکێشـــابێت، بەدەم هەنســـکهەڵکێشـــانەوە هەڵســـایەوە و بەڕاکردن لە ژوورەکە چووە دەرەوە. ئەو کردەوەیەی دایکم هەمیشە ئەو ڕۆژەم بیر دەخاتەوە، لە پەنجەرەکەوە بینیم بە جامێکی فافۆنەوە بۆ حەوشـــەکە چوو، لەو تەشـــتەی مام ســـەلام لەژێر کەلاکی ئاســـکەکاندا دانابوو، جامێکی لە خوێنی چۆڕاوە پڕ کرد، وەکوو بەدزییەوە ئەوە بکات، بەردەوام لە دەرگای حەوشـــەکە و خەڵکەکەی دەڕوانی. کاتێک گەڕایەوە، هاتە بەردەمم دانیشـــت، ســـەر و قژی ئاڵۆزکابوو، کلی ڕەشـــی چاوی بەســـەر ڕوومەتیدا چۆڕابوونەوە، هەر ڕێک دوو جۆگەلەی ڕەشـــاو بوون و بۆ ژێر ملی چووبوون. دوای ئەوەی خۆی چەند قومێکی لە خوێنەکە دا، بەرەو ڕووم ڕایگرت: 'دەی کچێ لەو خوێنە بخۆرەوە، بە خوا مەگەر ئەوە ئەو دەردەی ئێمە چارەسەر بکات!' لێم ڕوانی و سەرم لێ ڕاوەشاند، بە دەستەکەی تری پڕی کرد بە قژمدا و لە خۆی نزیک کردمەوە: 'دەوایە دەوا، دەی دەمی پێوە نێ!' جامەکەی نا بە لێومەوە و کاتێک دەمم کردەوە، دەســـتی بەرز کردەوە و ناو دەمم لە خوێنی ئاســـک پڕ بوو. دوای ئەوەی ســـێ جار بەو شـــێوەیە قومم لە خوێنەکە دا، پاشـــان ئەوەی لە جامەکەدا مابوو؛ خۆی خواردیەوە. داوای لێ

کردم لای کەس باســـی نەکەم، پاشـــان پێی گوتم کە ئەوە نهێنیی خۆی و نەنکیەتی و چارەســەری هەموو دەرد و ترسـێک دەکات.
دوای ئەوە دەســــتی گرتم و بەدوای خۆیدا بۆ ئەو ژوورە بردمی کە من و ئەو لێی دەنووستین، دۆشەکێکی ڕاخست و هەردووکمان بەتەنیشتی یەکەوە ڕاکشاین، دڵم تێکەڵ دەهات و بەردەوام هێڵجم دەدا. بێدەنگ هـەردووکمـان لـە دارەڕای بنمیچی ژوورەکـەمـان دەڕوانی، هێشــتا خەیاڵم لای بۆن و تامی خوێنەکە بوو، هەندێک جاریش کارژەلە مردووە مەلۆتکەکانم دەهاتەوە پێش چاو، گوێم لێ بوو دایکم پرخەی خەوی دەهات، نازانم منیش چەند دوای ئەو خەوم لێکەوت!"
لەو کاتەدا مینا و گوڵە لە دەرگا دەدەن و مەســــتوورە لەو خەیاڵەی دادەبڕن. کـاتێک دەرگـایـان بۆ دەکـاتەوە، پێش چۆنی و چاکی؛ پێکەوە دەڵێن: "خوشــــکێ گیان، پاقلاوە و کولامان لەگەڵ خۆمان هێناوە!"

## ١١

مەســتووره لەو ڕۆژەوەی بۆ شــوقەکانی ئیســکان هاتبوو، بەیانیان بەناو ماڵەکانی گەڕەکی ئیســـکاندا بۆ بەردەم بارەگای یـەرمووک دەچوو، هـەموو جـارێـک پۆلیســـی ئـەو مـەرکـەزەی بە تەنیشت بارەگاکەوە بوو؛ دەریاندەکرد، بەڵام ڕۆژی دواتر پێش خۆرکەوتن لەگەڵ چەند ژنێکی ڕەشپۆشدا پەیدا دەبوونەوە. وەکوو جێژوانی ئەو ژنانەی لێ هاتبوو، بە درێژاییی ئەو ڕۆژە ســەریان بەیەکەوە دەنا و گلەیی و دەردەدڵیان لای یەکتری دەکرد. شــێخ بایزی مێردی هەڕەشــەی ئەوەی لێ کردبوو کە ئیتر بۆ بەردەم بارەگای یەرمووکی حیزبی بەعس نەچێت، بەڵام هەموو جارێک لە گەڕانەوەیدا بیری قســـەکانی شـــێخ بایزی مێردی دەکەوتەوە. بەیانییەک دوای ئەوەی لە پۆلیسی بەر دەرگای بارەگای یەرمووک هەواڵی خەڵکی جەلەمۆرد دەپرسـێت، پۆلیســەکە تەنها ســەر بۆ

مەســـــتووره ڕادەوەشـــێنێت و شـــانەکانی هەڵدەتەکێنێت. لە گەڕانەوەیدا لە بەر خۆیەوە دەڵێت: "لەوە دەچێت ئەو پۆلیســـە عەرەب بێت!"

لە گەڕانەوەدا، بەردەوام کلیلی ئەپارتمانەکەی لەناو دەســـتی ڕاستیدا بوو. زیاتر بۆ کاتژمێرێک دەبوو لەســەر سەکۆی بەردەم ئاپارتمانەکەدا دانیشـــتبوو، بە دەســـتی چەپی زوو زوو ســـەری دەخوراند، بیری لەوە دەکردەوە ٬کە داوا لە شـــێخ بایزی مێردی بکات تاوەکوو ڕۆژێک لەگەڵی بۆ بارەگای یەرمووک بچێت، چونکە ئەو عەرەبی دەزانێـت، بـەڵام وەکوو هـەموو جـارەکـانی تر، مەســـتووره نەیدەوێرا ئەو داواکارییە لە شـــێخ بایز بکات. هەر چەندە مەجیدە شـــەلی چەند جارێک لەگەڵ خۆی بردبوو، بەڵام پۆلیسەکان تەنها شانیان بۆ مەجیدە شەلیش هەڵتەکاندبوو.

ئەو شوێنەی مەستووره ڕۆژانە لێی دادەنیشت، بەسەر چیمەنی بەردەم باڵەخانەکاندا دەیڕوانی، منداڵەکان لەوێ هەموو ڕۆژێک تۆپێنیـان دەکرد. مـەســـــتووره هـەندێک جار لـە دوورەوە و لـە پەنجەرەی ئەپارتمانەکەیەوە چاودێریی دەکردن، تەنها لەبەر ئەوەی گوێی لە دەنگیان بێت. ڕۆژانە دەهات لەو شوێنە دادەنیشت کە دە مەترێک لە منداڵەکانەوە دوور بوو. منداڵەکان لەسەر ئەوەی کێ پاشـــقولی لەوی تر گرتووە، بوو بە دەنگەدەنگیان و دەســـتیان دایە یەخەی یەکتری. هەردوو تیپەکە بەرامبەر یەکتری ڕاوەستان، پێش ئەوەی پەلاماری یەکتری بدەن، مەســــتووره خێرا چوو لە نێوانیاندا ڕاوەســـتا، لەو کاتەدا یەکێک لە منداڵەکان لێی پرســـی: "نەنە، ئەی بۆچی تۆ حەکەمییەکەمان بۆ ناکەیت؟"

پاشـــان ئەو منداڵەی ئەمەی بە مەســـتوورە گوت، فیقەنەیەکی باغەی زەردی بەرەو ڕووی مەستوورە ڕاگرت، فیقەنەکە قەیتانێکی ڕەشــی پێوە بوو. مەســتوورە پێی گوت: "باشــترە خۆتان فێڵ لە یەکتری نەکەن، ئیتر ئێوە حەکەمتان ناوێت! ئینجا ڕۆڵە گیان، من چووزانم حەکەمی بکەم!"

منداڵێکی سـوورکاری پێسـت سـپیی چاوسـەوز کە ڕوخسـاری، وردەخاڵی زەردی لەســەر بوو، فیقەنەکەی لە دەســتی هاوڕێکەی وەرگرت و دوای ئەوەی دوو جار فووی پێدا کرد، دەســتی بەرەو ڕووی مەســـتوورە درێژ کرد: "بۆ نازانیت، ئەی تۆ لە تەلەڤزیۆن یاریی دووگۆڵیت نەبینیوە؟ هەرچ کەسـێک بەئەنقەسـت پاشـقولی لەوی تر گرت یان جلەکانی ڕاکێشــا، تۆ فوو بە فیقەنەکەدا بکە. باشە نەنە گیان؟ خۆ زەحمەت نییە!"

لە کوڕە منداڵەکەی ڕوانی: "باشـە ڕۆڵە سـەردار، ئەگەر ئێوەش فێڵ لە یەکتری نەکەن، ئەوا دوایی یەکی چنگێک هەنجیری وشکتان پێ دەدەم."

"لایەنگریی کەس نەکەیت!"

کاتێک سـەردار ئەمەی گوت، پەنجەی بەرەو ڕووی مەسـتوورە درێژ کردبوو، وەکوو مەبەسـتی بێت هەڕەشـەی لێ بکات، ئەویش زەردەخەنەیەکی خســتە ســەر لێوی و لە وەڵامدا گوتی: "نا... نا، چۆن!"

ناوی منداڵەکانی یەک یەک دەزانی، پاشان لە کەنارەوە ڕاوەستا و فیقەنە زەردەکەی لەناو دەســت بوو، لەگەڵ منداڵەکاندا لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەچوو. مەسـتوورە هێشـتا بۆ جارێکیش فووی

بە فیقەنەکەدا نەکردبوو، یەکێک لە منداڵەکان تۆپەکەی برد و نایە بنباڵی و بۆ لای مەستوورە هات، کاتێک گەیشتە بەردەمی، گوتی: "نەنە، دەی بە هەموو توانات فوو بە فیقەنەکەدا بکە!"

"بۆچی، خۆ هیچ ڕووی نەداوە؟"

"نەخێر، چونکە یاری تەواو بوو."

مەستوورە لە منداڵەکەی ڕوانی و پێش ئەوەی فوو بە فیقەنەکەدا بکات، هەموویان هاتن و چواردەوری مەستوورەیان دا. دوای ئەوەی فیقەنەکەی لێ دا، یەکێک لە منداڵەکان گوتی: "وا بزانم هەنجیرەکەمان حەلاڵ کرد، وا نییە نەنە گیان؟"

بە چواردەوری مەستوورەدا ڕاوەستابوون و دەستیان بەرەو ڕووی ڕاگرتبوو، ئەویش دەستی کرد بە گیرفانی پاڵتۆکەیدا و یەک یەک چنگی منداڵەکانی لە وشکەهەنجیر پڕ کرد، پاشان وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت، زۆر بە هێواشی و لەژێر لێوەوە: "هەنجیری ناوشوان!"

هەندێک جار مەستوورە ڕۆژانی گەرما مەتارەیەک ئاوی سارد و پەرداخێکی لەگەڵ خۆی بۆ ئەو جێگایە دەبرد، کاتێک منداڵەکان یارییەکەیان تەواو دەبوو، خێرا هەڵدەستا و بەرەو لایان دەچوو.

جارێکیان یەکێک لە منداڵەکان بە مەستوورە دەڵێت: "ئەرێ نەنە، بۆچی بەخۆڕایی ئاوی ساردمان پێ دەدەیت؟"

مەستوورە لە وەلامدا بە منداڵەکەی گوتبوو: "دڵم پێتان دەکرێتەوە، منداڵی کچەکانم هاوتەمەنی ئێوەن و ئێستا من لێیان دوورم و زۆر غەریبییان دەکەم."

دوای ئەمە، یەکێک لە منداڵەکان پێی دەڵێت: "نەنە، هەموو کەس دەڵێت تۆ بێکەسیت!"

"چۆن بێکەسم! ئەو خەڵکە ڕاست ناکەن و چوار کچم هەن: بەهار، نێرگر، کوێستان، ژیان، خدری مێردیشم لە سەفەرە."

هەمان منداڵ پێی دەڵێت: "جا نەنە گیان لەبان جادەی شەستی دەتوانیت تاکسییەک بگریت و بچیت بۆ لایان، خۆ ئەوەندە زەحمەت نییە!"

"زەحمەتە، زۆر زۆر زەحمەتە، ئەوان لە شوێنێکی زۆر زۆر دوورن، مەگەر خوا بۆخۆی بزانێت چەند لێرەوە دوورن!"

ئەمەی بە هەڵەشەیی و بێزارییەکەوە بە منداڵەکە گوت، پاشان وەکوو خۆیشی لە دەنگ و هەڵچوونی خۆی ترسابێت، دەستی بە دەموچاویدا هێنا و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. منداڵەکە لە مەستوورەی ڕوانی و دەستی گرت و چەند هەنگاوێک لەگەڵ خۆیدا بردی و لەوێوە تاکسییەکانی پێ پیشان دا: "ئەگەر ناونیشانی ئەو شوێنە بدەیت بە شۆفێری ئەو تاکسییانە، لە هەرچ جێگایەک بن ئەوان دەزانن، ئیتر خوای دەکرد ئەو شوێنە لەسەر مانگیش دەبوو، چونکە ئەوان هەموو شوێنێک پێ دەزانن!"

لەدوای ئەو ڕۆژەوە، قسەی ئەو منداڵە تەواوی خەیاڵی ئەویان داگیر کردبوو، چەند جارێک ئەوەی بە خۆی گوتبوو: "ئەوەتا دڵی منداڵ پاکە و بێ غەلوغەشە، دیارە کچەکانم لە ژیاندا ماون و پێدەچێت ئێستا منیش نەنک بم!"

## ١٢

کوڕان و کچانی گەڕەکی ئیســـکان بەجیا یارییان دەکرد، مەســتووره هەندێک جار لە نێوانیاندا دادەنیشــت و بە نۆرە لێی دەڕوانین. زیاتر لە هەشت کچی نزیک تەمەنی دە بۆ دوازدە ساڵان لەســـەر شـــۆســـتەی نێوان باڵەخانەکان دوای نیوەڕوان یارییان دەکرد، بەردەوام خەریکی پەتپەتێن و خەتخەتێن بوون. مەستووره دوو لەت خشــتی ســوور لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا بوو، پێش ئەوەی کچەکان بێن بۆ ئەو جێگایە، زوو زوو خەتی خەتخەتێنەکەیانی بۆ تۆخ دەکردنەوە، لێی دەڕوانین و لە خەیاڵی خۆیدا قســـەکانیانی دووبارە دەکردەوە.

ئەو ڕۆژە کاتێک کچەکان بۆ ئەو جێگایە هاتن، شـــەڕ و دەمەبۆڵەیان لەســـــەر ئەوە بوو ئاخۆ کێ یەکەم کەس یارییەکە دەست پێ بکات. کاتەکە ڕۆیشـت و ئەوان هێشـتا لەنێوان خۆیاندا

ڕێک نەکەوتبوون. مەستوورە بە کچەکانی گوت: "لە دێی دارەقووتە، دوایی لە جەلەمۆردیش کاتێک من لە تەمەنی ئێوەدا بووم، پێش ئەوەی هەرچ یارییەک دەست پێ بکەین؛ فیکلانکۆمان بۆ دەکرد."

یەکێک لە کچەکان لێی پرسی: "فیکلانکۆ! چۆن چۆنی دەکرێت؟"

مەستوورە دەستی دوو کچەکەی گرت و پێی گوتن: "فیکلانکۆ بە سێ کەس دەکرێت، ئاوا وەکوو ئێمە دەستی یەک دەگرن، دوای ئەوەی دەستمان چەند جارێک ڕادەوەشێنین، پاشان دەست لە یەکتر بەر دەدەین. کە دەستمان بەر دا، چەند جارێک دەستمان بۆ پێشەوە و دواوە دەبەین. لە کاتێکدا دەستمان ڕادەوەشێنین، پێکەوە دەڵێین: فیکلانکۆ، شالا مالا ئاوی دۆ، لە پاکی کە، لە پیسی کە، فیکلانکۆ."

مەستوورە دوای ئەوەی پێی گوتن، کچەکان بەسەرنجەوە لێیان ڕوانی، ئەویش چەند جارێک گوتی و ئەوانیش بە کۆرس بە دوایدا گوتیانەوە. پێی گوتن شێوازی دەست گرتنەکەیان چۆن دەبێ: "کاتێک وتمان فیکلانکۆ، بەپەلە هەرسێکمان هەردوو دەستمان دەخەینە سەر یەک."

پاشان دەستی کچەکانی بەر دا و پێی گوتن: "گوێ بگرن، هەر کەسە و خۆی ئازادە چۆن دەست دادەنێت، بە دوو جۆر دەست دادەنێین، یان هەردوو لەپی دەستت ڕووی لە یەک بێت، یان پشتی دەستەکەی دیکەت ڕووی لە لەپی دەستەکەی ترت بێت."

ئەمەی پێ دەگوتن و بە دەستی ئاماژەی پێ دەکرد. ئەو دوو کچەی لە شانی مەستوورەوە وەستابوون و پێشتر دەستیان گرتبوو، یەکێکیان گوتی: "دەی ئینجا؟"

"ئەگەر دوو کەس وەک یەک دەستیان دانا و یەکێکیان دەست دانانەکەی جیاواز لە دووانەکەی تر بوو، ئەوە دەبێ بە بەگ و دەچێت لەولاوە دەوەستێت و کەسێکی تر دێتە جێگای."

کچێکیان گوتی: "یانی ئەوەی دانانی دەستی لە دووانەکەی تر جیاواز بێت، براوەیە؟"

"بەڵێ."

مەستوورە دیسان دەستی کچەکانی گرتەوە، بەدەم دەست ڕاوەشاندنەوە: "خۆ ئەگەر هەرسێکمان وەک یەک دەستمان دانا، ئەوا دیسان فیکلانکۆ دووبارە دەکەینەوە، تا ئەو کاتەی یەکێک دەستی لە دووانەکەی تر جیاواز دادەنێت."

یەکەم و دووەم تاوەکوو شەشەم فیکلانکۆیان کرد و چوونە ئەولاوە و بێدەنگ ڕاوەستان و لە مەستوورەیان ڕوانی، لە کۆتاییدا دوو کچ بەتەنیا مابوونەوە، مەستوورە یەکێک لە کچە براوەکانی بانگ کرد: "ئەگەر لە کۆتاییدا دوو کەس مانەوە، ئەوا یەکێک بەشدارییان لەگەڵ دەکات تەنها بۆ تەواوکردنی فیکلانکۆکە، تاوەکوو لەنێوان ئەو دووانەیشدا یەکێکیان دەربچێت."

یەکێک لە کچەکان گوتی: "ئەوەی یەکەم بێت، چیی پێ دەڵێن؟"

"بەگ."

یەکێکی تریان پرسیی: "ئەی دوای بەگ؟"

"پاش بەگ، دوو بەگ، ئیتر بەو چەشـنە تاوەکوو دەگاتە سـەر دوایین کەس کە پێی دەڵێن قڕە."

کچێک بوو بە قڕە، کچێکی قژ کورتی کورتەباڵا بوو کە پێدەچوو بە تەمەن سـاڵێک یان دووان لەوانی تر منداڵتر بێت، لەژێر لێوەوە بێ ئەوەی لە مەستوورە بڕوانێ: "ئەی دوای ئەوە؟"

"ئەوەی بووە بە بەگ، یەکەم کەس دەبێ کە یاریی خەتخەتێن یان پەتپەتێنەکە دەکات."

"ئەی ئەگەر ویستمان چاوشارکێ بکەین؟"

"ئەوا کەسی قڕە لەسەر شار دەبێ."

مەسـتوورە دەسـتی هێنا بە قژی ئەو کچەدا کە کەوتبووە قڕە: "کێ دەڵێت تۆ جارێکی تر نابیت بە بەگ!"

## ١٣

دەنگی بێژەری ڕادیۆکە بە باڵای ئەو باڵەخانانەی گەڕەکی ئیسـکاندا هەڵدەزنا، ئەو دەنگەی هەموو ڕۆژێک و بەیانیان زوو بانگی دەکرد، پیاوێکی دەنگگڕ بە زمانی عەرەبی لە بارەگای یەرمووکەوە و لەو بڵندگۆیانەی بە سەربانی باڵەخانەکەوە بوون، هەموو ڕۆژێک و پێش ئەوەی خۆر هەڵبێت؛ وتاری دەخوێند. لە گەڕەکەکانی تری شـاری هەولێرەوە دەبیسـترا. مەسـتوورە لە ناچاریدا بەیانیان پێش داگیرسانی ڕادیۆکە، بە بیانووی خۆڵڕشتن لە باڵەخانەکە دەچووە خوار، بەسەر شۆستەی نێوان باڵەخانەکاندا پیاسـەی دەکرد. هەرچەندە پەنجەی دەسـتی لە کونی گوێکانی ئاخنیبوو، بەڵام دەنگی وتارخوێنەکان بەردەوام لە گوێیدا دەزرینگانەوە، ناچار سەری دادەخست و بە نائارامی و خێرا خێرا بەسەر شۆستەکاندا دەگەڕا.

زیاتر لە دوو کاتژمێر و تاوەکوو کاتژمێر هەشــت، بڵندگۆکانی ســــەربانی باڵەخانەی یەرمووک بانگیان دەکرد و لێدوانیان دەدا، پاشــان دانیشــتووانی گەڕەکی شــوقەکانی ئیســکان بۆ ســەر کار دەچوون.

مەســتوورە دەیزانی کێ لە چ دەرگایەکەوە دێتە دەرەوە. کاتێک دەردەکەوتن، لێی دەڕوانین، هەر خۆی دەســتپێشــخەریی دەکرد و سـڵاوی لێ دەکردن. دوای ئەوەی گەورەکان لە ماڵ دەردەچوون، پاشــان لە دوورەوە و لەژێر لێوەوە منداڵەکانی گەڕەکی ئیســکانی دەژمارد. مەســتوورە ڕۆژێک بە مەجیدە شــەلی گوتبوو: "کچەکان ژمارەیان لە کوڕەکان زیاترە!"

مەجیدە شــەل لە مەبەســتی ئەو تێناگات. پاشــان مەســتوورە هەناســـەیەکی قووڵ هەڵدەکێشــێت و لێی دەڕوانێت و لە خەیاڵی خۆیدا دەڵێت: "کچەکان زوو زوو عاشق دەبن و ڕەدوو دەکەون."

وەکوو پیشــــەی هــەموو ڕۆژێکی، دوور و نزیک چاودێریی کچەکانی دەکرد تاوەکوو دەگەیشـــتنە ناو دەرگای قوتابخانە. لەبەردەم شوقەکانی ئیسکانەوە لە شانیانەوە دەڕۆیشت و تاوەکوو لە شــەقامە شــەســت مەترییەکە دەپەڕینەوە. ئەو ڕۆژە لەبەردەم قوتابخانەی ئامادەیی کچانی هەولێر ڕاوەستابوو، کاتێک گۆڕەپانی قوتابخانە بێدەنگ بووبوو، چووە لای فەڕاشـــی قوتابخانەکە، پرسیاری ئەوەی لێ کرد: "ئەرێ بۆ پاککردنەوە، کەستان پێویست نییە؟"

فەڕاشــەکە ژنێکی کورتەباڵای بۆرکەلەی هاوتەمەنی خۆی بوو، شــەش خاڵی شــینی لەســـەر چەناگەی کوتابوو، پاشــان لەژێر

چەناگەیەوە تاوەکوو ناو درزی مەمکەکانی؛ هێڵی ڕاست و چەماوە و خاڵی بازنەیی شـین بوون. خاڵەکان بەئەسـتەم دیار مابوون. سـەرتاپا جلی ڕەشـی لەبەردا بوو. هاتە بەردەم مەسـتوورە و دەستە ڕەقەڵە و باریکەکانی بەرەو ڕووی درێژ کرد و لێی ڕوانی:

"قوڕ وەبان سەر من، وە خوا پێنج سەر خێزان چاومان لەو چۆڕە مەعاشـەس، دەک لە خوا بەزیاد نەوێت، تۆ لەوانەس ماڵ و مێردی خۆیشـت بوێت، منێکی قوڕ وەسـەر بێکەس و بێ باوان چوار هەتیوم ها وەشوێنمۆ."

دوای ئـەوەی مـەسـتوورە گوێی لـەمـە بوو، هیچی نـەگوت. بەرامبەر یەک ڕاوەسـتابوون و بێدەنگ لە یەکتریان ڕوانی. ژنە فەڕاشـەکە دەسـتی خسـتە سـەر دەسـتی و بە مەسـتوورەی گوت:

"دیارە تۆیش وەکی من لێقەوماویت؟"

مەسـتوورە ئەوەی بە خەیاڵدا هات کە وەڵامی نەداتەوە و بڕوات، بەڵام لەژێر لێوەوە گوتی: "منیش کۆستکەوتووم، بێکەسم. جا بەس نییە شـوکور تۆ منداڵەکانت بۆ ماوەتەوە، من خوا ئەوەشی پێ ڕەوا نەبینیم."

ژنەی فەڕاش توند دەستی مەستوورەی گوشی و ماسوولکەی سەر ڕوومەتی هێنایەوە یەک و فرمێسک لە چاویەوە ڕژانە خوار. مەسـتوورە وەکوو لە هەسـتی ئەو تێگەیشـتبێت، بێ ئەوەی هیچ بڵێت، لە ناوچاوی ژنەکەی ڕوانی، دەستی لە دەستی ژنەی فەڕاش دەرهێنا و خێرا بە چەند هەنگاوێک لە حەوشـەی قوتابخانەکە چووە دەرەوە.

حەپســەی فەڕاش پێشــتر قســەی لەگەڵ مەســتوورە کردبوو، لەبەردەم بارەگای یەرمووک لە گەڕەکی ئیسکان یەکتریان بینیبوو، بەڵام دیار بوو هەردووکیان ئەوەیان لەبیر نەمابوو. کچانی گەڕەکی شوقەکانی ئیسکان پێیان دەگوت حەپسە خاڵاوی، هەندێک جاریش مەستوورە لە کچەکانی دەبیست کە بە حەپسە دۆم ناویان دەبرد.

ئەو ڕۆژە کاتێک گەڕایەوە بەردەم باڵەخانەکە، لە برســـاندا بەئەستەم دەیتوانی بە پلیکانەکاندا سەر بکەوێت. بانگی وتارخوێنی ڕادیۆکە هێشــتا لە گوێیدا دەنگی دەدایەوە، وەکوو هەموو ڕۆژێک بێژەری ڕادیۆکە ژن و پیاوی گەڕەکی ئیســـکانیان بۆ فەرمانی نیشتمانی ڕاسپاردبوو.

## ١٤

پەرداخێکی پڕ لە چای بە دەســـــتەوە بوو، چنگێک هەنجیری وشکی کردبووە گیرفانی پاڵتۆکەی، پاشان جامێک ماستی تێ کرد و جار جار کەوچکەچایەکی لە ماســـــتەکە دەدا. بەناو ماڵەکەدا دەهات و دەچوو، چووە بەر پەنجەرەکە و چاکەی دەخواردەوە و لە خەیاڵی خۆیدا دووبارە شــێوازی منداڵەکانی گەڕەکی ئیســکانی دەهێنایەوە بەر چاوی، یەک یەک ناوەکانیانی لەبەر خۆیەوە دەگوت، پاشـــــان خۆی گۆڕی و چووە دەرەوە و بـەرەو بـازاڕ بەڕێ کەوت.

لە شــەقامە شــەســت مەترییەکەوە بە دەســتەڕاســتدا بۆ ســەر ڕاستەشەقامی کەرکووک چوو، ئەو ڕێگایەی بەردەوام پێیدا بۆ ناو بازاڕ و بەتایبەتی قەیســـــەرییەکانی بەرامبەر قەڵاتێ دەچوو. مەســتوورە ڕێگای نەدەگۆڕی و بەردەوام بەســەر هەمان شۆســتە

و ڕێگادا بۆ ماڵەوەش دەگەڕایەوە. کاتژمێر لە ماڵەکەیدا نەبوو، بەڵام کاتێک بۆ بازاڕ دەچوو، لەپێش هەموو شــتێکەوە بۆ بەردەم دووکانی ئەو ســەعاتچییە دەچوو کە کاتژمێرێکی کۆنی بەســەر دووکانەکەیەوە هەڵواســیبوو. کاتێک دەگەیشــتە ئەوێ، بەرامبەر کاتژمێرەکە ڕادەوەســتا، دوای ئەوەی چەند جارێک ســەری بەلای ڕاســـت و چەپیدا خوار دەکردەوە، لەبەر خۆیەوە هەموو جارێک دەیگوت: "کاتژمێر چوارە."

هەموو جارێک بەو جۆرە لە کاتێکدا مەســـتوورە دەگەیشـــتە بەرامبەر کاتژمێرە ڕەشــەکە، هێشـتا پێشـنیوەڕۆ بوو. کاتژمێرەکە وێنەی ئەفسەرێکی لە ناودا بوو کە میلەکە بەبەر چاویدا تێدەپەڕی، هـەر چـەنـدە وێـنـەکـە ئـەوەنـدە کـاڵ بووبووەوە خـەڵکی بـازاڕ هـەنـدێکیـان لایـان وا بوو کـە وێـنـەی نـاو کـاتژمێرەکە؛ ژنێکی ڕەشپۆش بێت.

مەســـتوورە ڕۆژانە بەناو دەنگەدەنگی ئەو قەیســـەرییەدا تێدەپەڕی و بەســـەرنجـەوە گوێی لێ دەگرتن، لـە گۆڕەپـان و شـەقامەکانی دەوری قەڵاتێ دەسـوڕایەوە، لەو شـەقامانەی بێ دار و بێ دارگڵۆپ بوون. شۆستەکانی عەیامێک بوو بەردەکانی لەژێر پێی ڕێبوارانـدا لە خۆڵدا نقوم بووبوو، بە بیرەوەریی پیرانی شـار؛ هەولێر گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا هاتبوو، لەبەر ئەوە گەنجەکانی ئێستا نازانن ناوی ڕاستەقینەی شوێن و گەڕەکەکانی شار، پێشتر چی بووە!

هەموو جارێک کە ڕێگای بکەوتایەتە بازاڕ، دوای ئەوەی نان و هەنجیری وشک و شەکر و چای دەکڕی، دەچووە گەڕەکی عەرەب

و بەبەردەمماڵی حەلیمە زێباریدا تێدەپەڕی، هەواڵی مینا و گوڵەی لە فارســـی کوڕی حەلیمە دەپرســـی، ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: "لێرە نینە!"

دوای ئەوە خێرا بۆ گەڕەکی ئیســکان دەگەڕایەوە، تاوەکوو لە گەڕانەوەی دانیشــتووانی گەڕەک بەئاگا بێت. هەندێک جار وەکوو ئەوەی بییەوێت پێشــوازییان لێ بکات، دەچوو لەپێش باڵەخانەکان رادەوەستا، بێ ئەوەی بیاندوێنێت، تەنها یەک یەک لێی دەڕوانین.

لەگەڵ مەجیدە شـــەلی دراوســـێیدا کە دەرگاوان و فەڕاشـــی شــوقەکانی ئیســکان بوو، پێکەوە لەســەر ڕێگای خەڵکی گەڕەک رادەوەســتان. مەســتوورە چەند جارێک بە مەجیدە شــەلی گوتبوو کە چاودێریی کچەکان بکات و نەهێڵێت بە قەراغی پلیکانەکاندا خلیســـکێنە بکەن، بەڵام مەجیدە شـــەل لە مەبەســـتی مەســـتوورە تێنەگەیشـــتبوو. لە ئەپارتمانەکەیەوە کاتێک زەنگی پاســـکیلی دەبیســت، ڕایدەکردە بەردەم پەنجەرەکەی و دەبووایە بیبینیایە کێ بە ســواری ئەو پاســکیلەوە بوو، بانگی لە مەجیدە شـــەل دەکرد تاوەکوو چاودێریی بۆ بکات و بزانێت ئاخۆ کوڕ بوو یان کچ. مەجیدە شـــەل لەو خەمخۆرییەی مەســـتوورە تێنەدەگەیشـــت و دەیگوت: "کوڕە وازیان لێ بێنە منالْن!"

پاشـــان مەســـتوورە بە مەجیدە شـــەلی دەگوت: "کاکە مەجید، کچەکان نابێت پاسکیل لێبخوڕن!"

لە خەیاڵی خۆیدا بەردەوام بیری لێ دەکردەوە، بەڵام نەیدەوێرا کچەکان لەو ترســـەی ئاگادار بکاتەوە و پێیان بڵێت: "ئەگەر بنتان

پژا و خوێنتان لێ هات، ئیتر گیرۆدە دەبن و بە درێژایی تەمەنتان لە خەمی ڕزگارتان نابێت و خوێنتان ناگیرسێتەوە!

هەندێک لەو منداڵانەی مەستوورە لە سەرەتاوە ناسینی، گەورە بوون و گەڕەکیان بەجێ هێشــت و هەندێکیان نەگەڕانەوە، کاتێک پرســیاری لە کەســوکاریان دەکرد، ئەوەیان وەڵام دەدایەوە کە منداڵەکانیان دوای عەشــق کەوتوون، هەندێک جار خەونی پێوە دەبینین، یان کاتێک دڵی هەواڵی ناخۆشــی دەربارەی منداڵێکی گەڕەک پێ دەدا، چەند ڕۆژ بێدەنگی دایدەگرت و ماتەمینیی بۆ دەگێڕان.

ئەو ڕۆژانە شــێخ بایزی مێردی بە ڕۆژدا نەدەبینرا، تەنانەت مەستوورەش نەیدەزانی لە کوێیە و بۆ کوێ دەچێت، هەندێک جار لە نیوەی شــەواندا لە دەرگای ماڵی مەســتوورەی دەدا و لەناو دەرگــاکــەوە داوای ئــامــادەکردنی چێشــتی لێ دەکرد. دوای نــانخواردن، وەکوو خوویــەکی دەچووە گەرمــاوەکە و بــانگی مەســتوورەی دەکرد تاوەکوو پشــتی بشــوات و بیشــێلێت. ئەوە شــێوازی پەیوەندیی ژن و مێردایەتییەکەی نێوان مەســتوورە و شــێخ بایز بوو. پاشــان بیســت دیناری دەنایە مشــتی و هەر لە نیوەشــەودا چۆن دەهات، ئاواش خۆی لێ ون دەکرد. شــێخ بایز هەرگیز بە مەســتوورەی نەدەگوت بۆ کوێ دەچێت و کەی بە ڕێکەوت ڕێگای دەکەوێتەوە ماڵەکەی ئەو.

## ١٥

سەرەتای مانگی سێ، شێخ بایز ئێوارەیەک دێت بۆ لای مەستوورە، داوای لێ دەکات کە هەر چییەکی لە دراوسێکانی بیستووە؛ بۆی بگێڕێتەوە. مەستوورە تەنها ئەوەی لە خەیاڵدایە کە پێی بڵێت پشیلەکەی ون بووە. کاتێک ئەوە بە شێخ بایز دەڵێت، ئەویش لە مەستوورە توورە دەبێت و پێی دەڵێت: "هەی بێئەقڵی نوقسان، دنیا بە قوڕ گیراوە، کەچی تۆ خەیاڵت لە لای پشیلەیەکی کوێرە!"

بەبێ ئەوەی لە شێخ بایز بڕوانێت، دەڵێت: "بە خوا گوناحە و لە دەرەوە ناژی، دڵم هەر لە لایەتی!"

"خەڵکی باس لەوە دەکەن گوایا چەکدارێکی زۆر بۆ ناو شاری هەولێر هاتوون، تۆ هیچت لەو بارەوە بیستووە؟"

پاشان مەستوورە بە شێخ بایز دەڵێت: "مەجیدە شەل دەڵێت کە سلێمانی و ئەو شارانەی تر ڕزگار کراون!"

"ڕزگار کراون ڕزگار کراون، مەگەر تەڕەماش بووبن، بەئاسانی بۆیان ناچێتە سەر!"

دوای ئەوەی شێخ بایز ئەمەی بە بێزارییەکەوە گوت، زەرفێکی دایە دەستی مەستوورە کە هەزار دیناری تێدا بوو. لە ڕۆیشتندا شێخ بایز گوتی: "مادام ناو شار پڕ بوون لە سەگ و گورگ، لەوانەیە بۆ موسڵ یان کەرکووک بچم. تۆش بە مەجید، بەو سەگە شەلە بڵێ شتت بۆ بکڕێت و خۆت لە ماڵ نەچیتە دەر! بە خوا ناحەز بزانن، داخی دڵی خۆیان بە تۆ دەڕێژن!" تەنها سەر بۆ بایز ڕادەوەشێنێت.

ڕۆژی دوای ئەو شەوەی شێخ بایز مەستوورە بە جێ دێڵێت، تایەکی گەرمی لێ دێت و بە درێژایی هەفتەیەک لەناو جێگادا دەکەوێت، تەنها بۆ نان و ئاو خواردن و چوون بۆ تەوالێت هەڵدەستا. زۆربەی کات لەسەر تەختی خەوەکەی بێدەنگ ڕاکشابوو، پەردەکانی دادابووەوە و چەند ڕۆژێک بوو کارەبای ماڵەکەی بڕابوو، بێئاگا بوو لەوەی لە دەرەوەی ماڵەکەی ئەو چی ڕوو دەدات.

ئەو شەوەی لە ناوشاردا بووبوو بە تەقەکردن و دەنگی تەقینەوەی بیستبوو، دۆشەکەکەی بردبوو بۆ گەرماوەکە و جێگاکەی لەوێ داخستبوو. قسەکانی شێخ بایزی مێردی؛ مەستوورەی نەترساندبوو، بەڵکوو تەنها بیستنی دەنگی گوللەکان بوون ترسیان دەخستە دڵی مەستوورەوە.

دوو ڕۆژ له گەرماوەکه نەهاتە دەرەوە، مەجیده شـــەل له دەرگاکەی دا و بانگی لێ کرد، دەنگی ناســـییەوە و بەدەنگیەوە چوو. مەجیده شەل هاواری کرد: "ڕزگارمان بوو! ڕزگارمان بوو!"

"له چی، مەجید؟ له چی ڕزگارمان بوو؟"

"کوڕە لەو ڕژێمه زاڵمه!"

"ئێ ئێ، ئەو تەقوتۆقانە ئەوە بوون؟"

"بەڵێ... بەڵێ."

مەستووره ده دیناری کرده دەستی مەجیده شەل و پێی گوت: "کاکه مەجید، توو خوا ئەگەر ڕێگات کەوتە بازاڕ، نان و شـەکر و چام بۆ بکڕە."

ئەو ڕۆژە بەردەوام لەناو شـــار و له گەڕەکی ئیســـکان دەنگی تەقەی تفەنگ دەبیســـتران، مەســـتووره له ترســـی بیســـتنی دەنگی گوللەکان، دیســـان خۆی له گەرماوەکه دەشـــاردەوه و بەتانییەکانی له سەر و گوێیەوە دەئاڵاند، کاتێک دەرگای گەرماوەکەی دەکردەوە که بچووایه بۆ تەوالێت یان گوێی له دەنگی مەجیده شەل بووایه.

مەجیده شـــەل هەموو ڕۆژێک هەواڵی بۆ دەهێنا، زوو زوو پێی دەگوت؛ تۆ چی دەکەیت له ژوورەوە، لەناو شـــــار ئاهەنگه و خۆشـــییه. بەو قســـانەی نەیدەتوانی ترس و دوودڵیی مەســـتووره بشـــکێنێت، چونکه شـــەو و ڕۆژ گوێی له دەنگی گولله و تەقینەوە دەبوو.

له دوای ئەو ڕۆژەوەی مەجیده شەل هەواڵی بۆ هێنا که شاری هەولێر لەدەســـت ڕژێمی بەعس ڕزگار کرا، بیســـت ڕۆژ بەســـەردا تێپەڕی. درەنگانی شــــەو، دوو جار به هۆڕینی ئۆتۆمبێلەکان و

دەنگی خەڵک لە خەو هەستا. کاتێک گوێی لە تەقەکان بوو، دیسان بەتانییەکانی بەسەر خۆیدا دا، دەستی نا بە گوێیەوە. شەقامەکانی شار پڕ بوون لە ئۆتۆمبێل، لەناو هەندێک گەڕەکی شار شەڕ و پێکدادان بوو، خەڵکی خۆیان بۆ ڕاکردن ئامادە کردبوو، گەلێکیشیان ڕۆژی پێشوو لە شار دەرچووبوون. لە نیوەی شەودا مەجیدە شەل دوو جار هات، بانگی کرد و لە دەرگا و پەنجەرەکانی دا. شەو سەربازەکانی ڕژێمی بەعس گەیشتنە ناو شاری هەولێر و خەڵکی لە ترسانداماڵەکانیان بەجێ هێشت. مەستوورە دوو جار بەخەبەر هات، بە چاوی خەواڵووەوە گوتی: "ئەو خەڵکە خوا غەزەبی لێ گرتوون و نازانن ئیسراحەت چییە!" پاشان چاوی چووەوە خەو، بێئاگا بوو لەوەی کە بەتەنیا لە شاردا بەجێ ماوە و ناو شاری هەولێر پڕ بووبوو لە سەرباز.

مەستوورە لە خەونیدا ڕێگایەکی دووری بڕیبوو، هیلاک و ماندوو دانیشتبوو، جامێکی پڕ لە خوێنی بە دەستەوە بوو، دوو قومی لە خوێنە شیرینەکەی ناو جامەکە دابوو. لە جێگایەکی نامۆ بەتەنیا بوو، هێشتا تامی خوێنەکەی لە دەمدا بوو، جێگایەک بوو کە تاوەکوو چاو بڕ بکات بە چواردەوریدا چۆڵەوانی. دونیا گەرم و بەردەوام خۆڵێکی زەردی ئاڵتوونی دەباری. ڕووتوقووت، هەردوو باڵی لەسەر مەمکی خۆی دانابوو. هەندێک جار لەو خەونەی بەئاگا دەهات و دیسان چاوی دەنووقاندەوە، وەکوو بیەوێت بزانێت ئاخۆ لەو چۆڵەوانییەدا بە کوێ دەگات. بە درێژایی ئەو شەوە قومی لە خوێنە شیرینەکەی ناو جامەکە دەدا، بەڵام وەکوو کانییەکی خوێنین لە بنی جامەکەدا بێت، بەردەوام خوێنی

لێ هەڵدەقولا. هەرچ جارێک لە تینوواندا لە خوێنەکەی دەخواردەوە، گوێی لە دەنگی دایکی دەبوو.

ئەو شـــەوە خەڵکی بە پێ و بە ئۆتۆمبێل کەوتبوونە ڕێ و لە هەولێر دەرچووبوون، مەســـتوورە بەیانی زوو تاریک و ڕوون لەتەنیشـــتی تەختی خەوەکەیەوە لەســـەر زەویی ژوورەکەی دانیشـــتبوو، وەکوو ئەوەی گوێی لە دەنگی گوللە و تەقینەوەکانی ناو شـــار نەبێت، لەو دوو ســـندووقە تەختە ســـەوزەی ژێر قەرەوێڵەکەی دەڕوانی کە کاتی خۆی بایزی مێردی لەگەڵ خۆی هێنابووی. مەستوورە دەیزانی کە ئەو دوو سندووقە سەربازین و پێشـــتر تفەنگ یان فیشـــەکیان تێدا بووە، چونکە خەڵکی دێی جەلەمۆرد زوو زوو لەو جۆرە ســـندووقانەیان لە نزیکی ئاوایی، دوای شـــەڕەکان لە جێگای ســـەربازگەکاندا دەدۆزییەوە. ناو ژوورەکەی و تا دەگەیشتە مەتبەخەکەی، پارچە جل هەڵڕژابوو، بۆ مانگێک دەچوو گسـکی لەماڵەکەی نەدابوو، تەنانەت دەسـتکاریی هیچی نەکردبوو.

پێشـــنیوەڕۆ مـەســـتوورە بـەدەم گۆرانیگوتنـەوە پـاڵتۆ ســـەربازییەکەی لەبەر کرد، پاشـــان شـــەرواڵە خۆڵەمێشـــییەکەی خدری لەپێ کرد، جزمە شـــینەکانی بە دەســـتەوە گرت و تاوێک لەناو دەرگای ئەپارتمانەکەیدا وەســتا، لە سـەر جادەکەی ڕوانی و لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەرێ ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە، بۆ دەڵێی قاتوقڕییە و کەس بە دەرەوە نییە! بزانە ئێســـتا ئۆتۆمبێلێکیش دەبینێت، تەنانەت گوێم لە دەنگی تاکسییەکانیش نییە!"

له دەرگاکەی هاتە دەر و بە ڕاســـت و چەپی باڵەخانەکەدا ڕوانیی، بەردەوام بوو و گوتی: "دەبێ ئەو سەگ و گورگە لە کوێ بن، تۆ بڵێی شوکور قڕیان تێ کەوتبێت!"

جزمەکانی لەپێ کرد و دەرگای ئەپارتمانەکەی بە کلیل داخست. چوو چەند جارێک لە دەرگای ماڵی مەجیدە شەلی دا، پاشان بەلای ڕاستدا بەرەو پلیکانەکان کەوتە ڕێ، لەبەردەم ماڵی دراوسـێکانیدا ڕادەوەســـتا و زوو زوو ســـەری دەنا بە پەنجەرەکانیانەوە و لە ژوورەوەی دەڕوانی، لەبەر خۆیەوە: "ئەرێ کەس نابینم! تۆ بڵێی خوانەکردە ئەمانیش بە دەرد خەڵک جەلەمۆرد چووبن!"

لە باڵەخانەکانی تری ڕوانی و دەنگی هەڵبڕی و بانگی کرد: "کاکە مەجید! مەجید!"

دەســـتی لە یەک هەڵپێکابوون و لەو خۆڵە زەردەی ڕوانی کە بەسەر شۆستەکاندا باریبوو، بەدەوری باڵەخانەکەدا گەڕا و کاتێک گەیشــتە ســەر ئەو شــەقامە ســەرەکییەی بەبەردەمی شــوقەکانی ئیســکاندا تێدەپەڕی، بە دەســتە ڕاســت و چەپیدا ڕوانی و لەوێوە ماڵەکانی گەڕەکی سەیداوەی لێوە دیار بوو.

مەســـتوورە لە نهۆمی دووی یەکێک لەو باڵەخانانەدا دەژیا کە بـایزی مێردی لـە ســـــەرەتـای دروســــتکردنی ئـەو گـەڕەکـەدا، سیانزە ساڵ پێش ئەو ڕۆژە بەتازەیی کڕیبووی. شێخ بایز ئاوای بە مەســـتوورە گوتبوو، بەڵام لە ڕاســـتیدا قاســـمی فارس ئاغا لە ســـەرەتای دروســـتکردنی شـــوقەکانی ئیســـکاندا چەند شـــوقەیەک دەکڕێت، پاشان یەکێک لەو شوقانە بە شێخ بایز دەبەخشێت.

لەسەر شۆستەی شەقامی شەست مەتری، بە دەستە ڕاست و چەپیدا ڕوانی، دەنگی هەڵبڕی و لەوبەری شەقامەکە و لە ماڵەکانی گەڕەکی سەیداوەی ڕوانی و بانگی کرد: "کتە... کتە! پش... پش!"

مەستوورە جارێک بانگی لە مەجیدە شەل دەکرد و جارێک ناوی کتەی دەهێنا. سەرپۆشەکەی لە دەم و لووتیەوە ئاڵاند، بایەک لەناو شارەوە بۆنێکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا کە مەستوورە نەیدەزانی بۆنی چییە، بەڵام هەستی دەکرد هەناسەی پێی توند دەبێت و پێڵووی چاوی پێی دەکزێتەوە. لە شەقامەکە پەڕییەوە و چووە ناو یەکەم کۆڵانی گەڕەکی سەیداوە و لەسەر کۆڵانەکە ڕاوەستا، دیسان لەبەر خۆیەوە بانگی لە مەجید و کتە کرد. لەو کۆڵان و سەر شەقامانەدا کەست نەدەبینی، تەنانەت باڵداریش بە دەرەوە نەبوو، بێجگە لەوەی زوو زوو ئۆتۆمبێلێکی سەربازی بەخێرایی بەسەر شەقامەکەدا تێدەپەڕی.

دوابنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بۆ گەڕەکی ئیسکان گەڕایەوە، لە ئیسکانی کۆن چوو بۆ بەردەم بارەگای یەرمووک، لەسەر شۆستەی بەردەم بارەگاکە تەنها تۆپەڵە خۆڵی زەرد دیار بوون، وەکوو بڵێیت ژنە ڕەشپۆشەکان لە گەرماندا بەخۆڵ بووبن. دەرگای بارەگاکە قوفڵی لێ درابوو، ئاڵا ڕەش و سوورەکان داگیرابوون، مەستوورە لەو کاتەدا دیسان چاوی چووە سەر نووسینی سەر دیوارەکە و بەحونجە خوێندیەوە: "*بژی سەرۆک*"

هەموو جارێک کە دەهاتە بەردەم ئەو بارەگایە، چەند هەناسەیەک بەرامبەر باڵەخانەکە ڕادەوەستا و دوای خوێندنەوەی

نووســـینی ســـەر دیوارەکە، خەیاڵی بۆ لای مینا و گوڵە دەچوو، پاشـــان بیری لە ماڵی حەلیمە زێباری دەکردەوە، ئەو ژنەی مینا و گوڵە ژووریان لێ بەکرێ گرتبوو، بە خەیاڵ بۆ گەڕەکی عەرەب دەچوو، دەرگا ســـەوزە ئاســـنەکەی ماڵی حەلیمە داخرابوو، چەند جارێک لە دەرگاکەی دەدا و بانگی لە مینا و گوڵە دەکرد، زوو زوو لەژێر لێوەوە دەیگوت: "ڕۆیشـــتوون، ئەمانیش وەک خەڵک جەلەمۆر ڕۆیشتوون، مینا و گوڵەش ڕۆیشتوون، ئەو جووتە بەبێ من بۆ ئەو موجەمەعە دوور دوورە ڕۆیشتوون!"

پاشـــان لەو کۆڵانەدا و بەبەردەم بارەگاکەدا خێرا خێرا لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەچوو، زوو زوو دەچووە بەر دەرگای بارەگاکە و لەپێ دەستی توند بە ڕووی دەرگا ئاسنە داخراوەکەدا دەکێشا، پڕ بە قوڕگی بانگی دەکرد: "من موســـتەحەق بووم بۆ ئەو موجەمەعە بچم! مینا، گوڵە، ژنە خاسەکان، خۆ نابێ بێ من بۆ ئەو موجەمەعە چووبن، ئەو موجەمەعەی خۆتان پێتان وتم لە بیابانێکی زۆر زۆر دوورە!"

مەستوورە وەکوو لە خەونێکی ڕاپەڕیبێت، دەستی بە دەموچاویدا دەهێنا و لەملاولای خۆی دەڕوانی، زوو زوو ســـەرەداوی ئەو خەیاڵەی بزر دەکرد، بەڵام هێشتا زۆر بەهێواشی و لەژێر لێوەوە دەیگوت: "ئەو موجەمەعە، لە بیابانێکی دوور دوور..."

## ١٦

لەسـەر جادەکان زوو زوو ڕێکەوتی ئۆتۆمبێلە سەربازییەکانی دەکرد، بەبێ ئەوەی لێیان بڕوانێت، بە شـــەودا گوێی لە دەنگی زڕەی زنجیری دەبابەکان بوو، بەردەوام دەنگی گوللە دەبیسترا.

مەستوورە لە گەڕەکی کۆماری بوو، لەبەردەم ماڵێک خڕەبەردێکی پڕ بە چنگی هەڵگرت، پاشان یەک یەک بەسەر ماڵەکاندا دەگەڕا و دەیکێشا بە دەرگا ئاسنەکاندا. ئەوەندە بەڕقەوە لە دەرگاکانی دەدا، لەسـەر هەموو دەرگایەک شـــوێنەواری لێدانی بەردەکەی بەجێ دەهێشت: "دەی خوا هاوار، ئەرێ ئەو خەڵکە لەکوێن!"

لە کۆتایی کۆڵانەکەوە کاتێک گەیشتبووە سەر شەقامە شەست مەترییەکە، لەسـەر قەلاتێوە دووکەڵێکی ڕەشـی بینی، وەسـتابوو و بێدەنگ لێی دەڕوانی و بەو دەستەی بەردەکەی تێدا بوو؛ ناوگەڵی پێ خوراند، هەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشـا، هەسـتی دەکرد ناو

ســـــییەکانی پڕ بووبوو لە بۆگەنێکی قورس و بێزارکەر، لەبەر خۆیەوە گوتی: "سووتاندیان! ئەو قەڵا کۆنەشیان سووتاند، وەکوو ماڵەکانی جەلەمۆرد سووتاندیان!"

مەستوورە سەری هەڵبڕیبوو و هێشتا لە دووکەڵەکەی سەر قەڵاتێی دەڕوانی، سەگێکی سپیی باریکەڵە بەخێرایی بە بەردەمیدا تێپەڕی، هەر چەندە دیار بوو سەگەکە سمتی گێڕ بوو، بەڵام خێرا ڕایدەکرد، لە ترساندا بەردەکەی دەستی بەدوای سەگەکەدا فڕێ دا، کە ئەوەندی ماوەی هەناسەیەک لە دەستی ڕاستیەوە هات و خێرا بەبەردەم مەستوورەدا تێپەڕی، ڕاچڵەکی و دەستی بەسەر دڵیدا هێنا، پاشان بەڕاکردن بەسەر شەقامی شەست مەتریدا بۆ ناو شوقەکانی ئیسکان گەڕایەوە. گەیشتەوە ناو ئەپارتمانەکەی خۆی و دەرگاکەی بە کلیل داخســـــت، بەردەوام لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "قوڕم بەسەر، چیم بە خۆم کرد!"

هاتبووە بەر پەنجەرەکە و لە دەرەوەی ڕوانی، هێشتا جزمەکانی دانەکەندبوو، شوێنەواری خۆڵێکی زەردی لەناو دەرگاکەوە بۆ بەر پەنجەرەکە هێنابوو، لەبەر پەنجەرەکەدا وەســـــتابوو لەگەڵ خۆی دەدوا: "شار کشوماتە و دەڵێی خۆڵی مردووی بە سەردا کراوە، ئیتر نازانم ئەو خەڵکە ماون یان مردوون! وا بزانم ئەوەشی ماوە، بووە بە ســـــەگ. ئەوەتا بزانە چ چۆڵەوانییەکە، خۆ لە بەیانییەوە نە گوێم لە دەنگێک بووە و نە کەسێکم لەسەر شەقامەکان بینی، وا بزانم دوێنێشـــــەو گوێم لە دەنگی قڕەی ئۆتۆمبێلەکان و هۆڕینی تاکسییەکان بوو، بە ملی شکاوم تەمبەڵیم کرد و هەڵنەستام بزانم

ئەو هاتوهاواره چییه! دەبێ شـــتێک ڕووی دابێت! ئیتر با بزانم، مەگەر مەجیده شەل هەواڵم بۆ بێنێت!"

دوای چەند هەناســـەیەک بێدەنگی، چاوی بە باڵەخانەکانی تردا گێڕا، وەکوو شـتێکی بیر کەوتبێتەوە، دەمی داچەقاند و بەچرپەوە گوتی: "بەڵام ئەمشـــەو چەند جارێک گوێم لە دەنگی گیاندار بوو، نازانم ئەوە خەون بوو یان ڕاستی. بینیم سەر ئەو جادانە، پێش و پشتی باڵەخانەکەمان، پڕ بوون لە چەقەڵی سەروگوێلاک خوێناوی، تۆ بڵێی من ئەمشەو ئەوەم بەڕاستی بینیبێت!"

ســەرپۆشــەکەی لە دەموچاوی کردەوە و تەکاندی، چوو لەبەر بەلوعەی مەتبەخەکەیدا دەموچاوی شۆرد، لەنێوان شوقەکانەوە لە ماڵەکانی گەڕەکی موفتیی ڕوانی: "ئەوەتا ئەو خەڵکە هەموو بوون بە گیانداری دڕندە، کوڕە جا من ئەمشـــەو چیم نەبینی! نازانم خەونە یان ئەو دیمەنانەی لێرەوە بینیم، ڕاسـتی بوون! تۆ بڵێی بە ناخێری گیانم، بەڕاسـتی ناوێرم بیڵێم، باشـترە ناوی نەهێنم... یان کاریگەریی جادووکانی من بێت، کە ئەو خەڵکە بووبن بە گیاندار یان قڕیان تێ کەوتبێت! لەوانەیە خەتای دەمڕەشـــێکی وەک من بووبێت. دەبێ جادووەکەی من گیرا بووبێت؟ ئەم ماوەی پێشـــوو وتم چی؟ چ دۆعـــایـــەکم لێ کردن؟ منیش جێگـاکـەی دایکمم گرتووەتەوە، دایکم کاتی خۆی وتی: 'ئەگەر من بمرم، لەم وڵاتە کارەســـاتێک ڕوو دەدات، پەلەوەرەکانیش فریای فڕین ناکەون!' هەمیشـــە بێ کەم و زیاد ئاوای دەوت، دوای مردنی ئەو؛ دنیا ژێراوژوور بوو، تۆ بڵێی ئـەوە بێـت و وەکوو دایکم وتی

کارەساتێکی لەو جۆرە ڕووی دابێت! لەوانەیە ئەو خەڵکە گەورە و بچووکیان لەناو چووبن، یان بووبن بە دڕندە!"

دوای ئەوەی جزمەکانی داکەند، بۆ سەر تەختی خەوەکەی گەڕایەوە. لە پەنجەرەکەوە لە دەرەوەی ڕوانی: "خۆ هەموومان ڕۆژانە ئەو دۆعایە لە یەکتری دەکەین، بێ ئەوەی هیچمان خەمی ئەوەمان بێت ئاخۆ دۆعاکانمان گیرا دەبن یان نا! 'هەی پیرێژنی دەمڕەشی جادووگەر،' هەرچ ڕۆژێک بێت تۆ قوڕ دەکەیت بەسەرماندا و ئەم شارە تووشی نەهامەتییەک دەکەیت!' حەبێی ژنی سمایلی حەماڵ دوو ڕۆژ پێش ئەمڕۆ، نە شەڕمان بوو، نە خوانەخواستە بەر حەبێ کەوتبووم، لەپێش دەرگای ئەپارتمانەکەی خۆیان لەناکاو لە بەردەممدا قوت بووەوە، چاوی پڕ بوو لە گومان و تووڕەیی، ئاوای پێ وتم، دەترسم قسەکەی حەبێ ڕاست بێت و من خۆم هەست بە خۆم نەکەم، وەکوو چۆن دایکم نەیدەویست گوێی لێ بێت کە پێیان دەوت جادووگەر، پێکەنینی بە قسەی ئەوانی تر دەهات، لە کاتێکدا ئەو جادووی لێ دەکردن، ئەویش بەردەوام لەوانی تر دەترسا و وەکوو من خەونی ناخۆشی دەبینی، تۆ بڵێی منیش خووەکەی دایکم گرتبێت!"

دیسان هەڵسابووە سەر پێ و لەبەردەم پەنجەرەکەدا ڕاوەستابوو، بە ڕاست و چەپدا لە باڵەخانەکانی ڕوانی، دەستی توند لێک سووین، لەژێر لێوەوە و بەچرپە وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "قوڕ بە سەرم، دەترسم تووشی لەبیرچوونەوە بووبم، بیرم نەکەوێتەوە چ دۆعایەکم لەو خەڵکە کردووە! زۆر دەترسم

جادوویەکم لە خەڵکی ئەم شـــارە کردبێت، یان یەکێک لە نزاکانم گیرابووبن. تۆ بڵێی ئەو خەڵکە..."

زوو زوو شێوەی دایکی دەهاتە پێش چاو، لەپێ دەستی توند بە ڕوومەتیدا هێنا، چاوی نووقاند و ناوچەوانی بە ڕووی شووشـەی پەنجەرەکەوە نابوو، هەســـتی دەکرد وێنەی دایکی خەیاڵەکانی دەشـێواند: "دوای مردنی دایکم، ئیتر قســەکانی ئەو و خەونەکانی من یەک بەدوای یەک دێنە دی! ئەو خەڵکە وردە وردە دیار نامێنن، باش ئەو ڕۆژانەم لەبیرە، لە ئاوایی جەلەمۆرد هێشــتا کچەکانم منداڵ بوون، هەموو ڕۆژێک بەیانیان زوو پێش ئەوەی دەموچاوم بشــۆم، خەیاڵم لای ئاودانی گوڵەکانم بوو. دوای ئەوەی ئاوی گوڵەکانم دەدا، خێرا بەترســـەوە یەک یەک بەســـەر منداڵەکاندا دەگەڕام، نازانم ئەو ڕەشــبینی و ترســەم لە کوێوە بەمیراتی بۆ مابووەوە! هەر چواریان هێشــتا لە خەودا بوون، پێش منداڵەکانم؛ خدرم بەخەبەر هێنا، پاشــان چوومە بەرهەیوانەکە و جامێک ئاوم ڕشـت و نزای ئەوەم کرد کە ئەو هەموو خەو و خەیاڵە شـوومەم نەیەتە دی. خدر و منداڵەکان لە ماڵ دەچوونە دەرەوە، ئەوسـا لە دێی جەلەمۆرد خدر دەچوو بۆ شـوانی و کچەکانیش لە قوتابخانە بوون، دیســـان خەیاڵی خراپم دەکرد و بەتەمای گەڕانەوەیان نەبووم، ئەوە تەمەنێکە و تاوەکوو ئەمڕۆ ئەوە خەمی من بووە. ئەوکات ناخۆشترین خەونم ئەوە بوو کە بە دەستی خۆم؛ خدر و منداڵەکانم ژەهرخوارد دەکرد و پاشان گۆشتی جەستەیانم دەبڕی و دەرخواردی ســـەگەکانم دەدا، ئینجا خوێنیانم دەکردە بنی گوڵەکان. دووبارەبوونەوەی ئەو خەون و خەیاڵەم وای لێ

کردبووم شەوانە خەو نەدەچووە چاوم و بەردەوام هەستم دەکرد نەخۆشـم. چەندین جار خۆم ئەو ژەهرەم خواردەوە، بەڵام بێجگە لە سـکئێشـەیەکی کەم، هەسـتم بە هیچی تر نەکرد. زۆر هەوڵم دا ئەو خەونانەم نەیەتە دی. ئەو ڕۆژانەم باش لەبیرە کە ویســـتم لەدەست ئەوان خۆم ڕزگار بکەم و لێیان دوور بم و بەتەنیا بژیم، جارێک لە ماڵ ڕۆیشـتم و لەو کێو و هەردە خۆم شـاردەوە، ئیتر ماڵی خدر بە قوڕ گیرێت لەکۆڵم نەبووەوە و پەلی منداڵەکانی گرتبوو، هاتن و دۆزیمیانەوە، منیش دیسان کەوتمەوە ناو گێژاوی ترس و دوودڵییەوە. دەزانم ئێســتا خدر و منداڵەکان لە شــوێنێک دەژین، خدر چاوەڕوانمە و کچەکانم هەر چواریان بوون بە سەرە ژن و خاوەنی ماڵ و منداڵی خۆیانن، ئەوان ئێســـتا خۆیان دایکن. خەڵکی دێی جەلەمۆرد هەموو دەیانزانی دایکم جادووبازە و منیش ئەو خووەم لەوەوە بەمیراتی بۆ بەجێ ماوە. خدر چارەی دایکمی نەدەویســـــت، بەردەوام گلەیی ئەوەی لێ دەکردم کە کچەکانمان چوونەتەوە ســـەر من و دایکم. لەو ســـاڵانەی دواییدا ئەوەم بۆ دەرکـەت کـە خـدریش ڕقی ئـەوەی لـە دڵدا بوو کـە یـەکێک لـە نەوەکانمان کوڕ نەبوو."

لـەنێوان پـەنجـەرەی ژووری نووســـتنـەکـەی و مەتبەخەکەیدا هاتوچۆی بوو، زوو زوو خۆی بێدەنگ دەکرد و گوێی دەگرت: "لە بەیـانییەوە گوێم لـە ژاوەژاوی حـەبێ و ســـالـەی حـەمـاڵ و منداڵەکانیان نییە، دەی دەبێ مەجیدە شــەل لە ماڵ بێت؟ ئەمشــەو لەپێش باڵەخانەکان ســەگەکان دەوەڕین، پاشــان گوێم لە واقەواقی چەقەڵەکان بوو، بەڵام خۆیشــم لەوە دوودڵ بووم ئاخۆ دەبێ ئەو

چەقەڵانە چۆن بۆ ناو شـــار هاتبن! ئەگەر ئەوەی ئەمشـــەو خەون بووبێت، دەی ئەوەی ئێســـتا دەیبینم و گوێم لێیە و بۆنی دەکەم؛ چییە؟ خەون و خەیاڵە یان ڕاستییە؟ ئەوەتا بزانە چۆن شار خۆڵی مردووی بە سەردا کراوە!

# ١٧

خەریکی کۆکردنەوەی ناو ماڵەکەی بوو، جلەکانی خۆی جیا کردنەوە و بێ ئەوەی قەدیان بکات؛ لە کەنتۆرەکەی ئاخنین. ئەوەی لە بایزی مێردی بە جێ مابوو، کردنیە ناو دوو توورەکە و بردنی لە باڵکۆنەکە داینان. کاتێک گسکی ماڵەکەی دەدا، لە کون و قوژبن و ژێر تەختی خەوەکەیدا دەسرە خوێناوییەکانی کۆ کردەوە، یەک یەک لێی ڕوانین و لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەی خوێنخۆرا"

کاتێک مەستوورە ئەمەی گوت، بینیی دەسرەکان هەموویان کتە جوویبوونی، بە جۆرێک بەئەستەم ڕەنگی خوێنەکەیان پێوە مابوو.

بەو گەرمایە ملپێچێکی لە سەر و ملیەوە ئاڵاندبوو، دوو جووت گۆرەویی لە پێدا و بەهەناسەبڕکێ لەسەر قەراغی تەختی خەوەکەی دانیشتبوو، پەردەکانی دادابوونەوە، لەژێر لێوەوە گوتی: "قوڕ بە سەرم، دەبێ ئەو پشیلە کوێرە بۆ کوێ چووبێت!"

هەستا چوو بۆ مەتبەخەکە و نانێکی ڕەقی هێنا، لەسەر تەختی خەوەکەی ڕاکشا و بەتانییەکانی لە خۆیەوە ئالاند و گوتی: "بینیم، دوێنێ دوو دالّە کەرخۆرەی دەنووک خوێناوی هاتبوونە بەر پەنجەرەکەم و لە پەسا بە دەنووک لە شووشەکەیان دەدا. بەو چاوانەی خۆم بینیم ڕەوەچەقەڵێک بەبەردەمی شوقەکەدا تێپەڕین. نازانم دەبێ کەسی تر بەزیندوویی لەم شاردا مابێت! شەوی ڕابردوو ئەوەی گوێم لێ بوو، تەنها دەنگی چەقەڵ بوو کە جاربەجار لەپشتی شوقەکانەوە لەگەڵ سەگەکان دەبوو بە شەڕیان و بەر دەبوونە یەکتری. نازانم سوپا و تاقمی کێ براوە بوون، هەر چەندە بەردەوام قروسکەی سەگم دەبیست!"

دەستی لە پێش خۆیەوە پان کردەوە و لە لەپی دەستی ڕوانی، دوای چەند هەناسەیەک؛ بۆنی پێوە کردن و بە دەموچاویدا هێنانی. چاوی نووقاندبوو، توند هەردوو دەستی بە ڕوویەوە گرتبوو: "باش بیری لێ بکەمەوە، بزانم ئەو ڕۆژانە چیم وت، داخۆ چ دۆعایەکم لەو خەڵکە قوڕبەسەرە کردبێت!"

دەستی لەسەر دەموچاوی لا برد و سەری هەڵبڕی و لە بنمیچەکەی ڕوانی: "ئەمڕۆ بێت یان سبەی، لەم شارەدا هەموو شتێک وەکوو خۆی لێ دێتەوە. خۆ ئەگەر ئاواش مایەوە، ئەوە گوناحی خۆیان لە ملی خۆیان! هەڵبەتە خەڵکی ئەم شارە خۆیان قابیلی ئەوەن. ئیتر هەر کەسە و بەگوێرەی نیازی دڵی خۆی. خۆ ئەگەر هەمووشیان مردبن، مادام مسوڵمانن؛ دەبێت بێخەم بن، بۆخۆیان ئێستا لە بەهەشتن. ئەوە قسەی مەلا مستەفای مەلای ئاوایی جەلەمۆرد بوو!"

دوو ڕۆژبوو خەڵکی هەولێر ڕەویان کردبوو، بەیانیی ئەو ڕۆژ مەستوورە خۆی گۆڕیبوو، کلیلەکانی لە گیرفانی پاڵتۆکەی دەرهێنا و بە دەستیەوە گرتنی، چوو بۆ نهۆمی سەرەوە و لەبەر دەرگای ماڵی سمایلی حەماڵدا ڕاوەستا، دەستی بەرز کردبووەوە و ویستی لە دەرگاکەیان بدات، کاتێک ڕووخساری حەبێی ژنی سمایلی حەماڵی بیر کەوتەوە، پەشیمان بووەوە و دەستی داگرتەوە، گەڕایەوە و بە پلیکانەکاندا بۆ نهۆمی یەکەمی باڵەخانەکە چووە خوار.

بێ وەستان، دوو جار لەپی دەستی بە دەرگای ماڵی مەجیدە شەلدا کێشا. دوای ئەوەی چەند هەناسەیەک ڕاوەستا، لە خەیاڵیدا ویستی پرسیاری کتە لە دراوسێکانی بکات، پەنجەی لەسەر زەنگەکە دانا، پاشان چەند جارێک بانگی لە مەجیدە شەل کرد. دانیشتووانی شوقەکانی ئێسکان دەیانزانی مەجیدە شەل ژنی نییە و بەتەنیا دەژی، مەستوورەش چەند جارێک لای هەندێک کەس گوتبووی مێردەکەم سەربازە و مانگی جارێک بۆ ماڵ دێتەوە، بەڵام لای مەجیدە شەل ڕاستییەکانی گوتبوو. هێشتا لەبەردەم پەنجەرەکەی ماڵی مەجیدە شەلدا وەستابوو، لە پەنجەرەکەوە تاوێک لە ژوورەوەی ڕوانی، دوای ئەوەی دڵنیا بوو لە ماڵەوە نییە، بیری لەوە کردەوە بۆ ناوبازاڕ و دەوری قەڵاتێ بچێت، بەڵکوو لەوێ هەواڵێکی دەست بکەوێت.

هاتبووە سەر شەقامی شەست مەتری و لە ڕاست و چەپی ڕوانی، ڕۆژانی تر ئەو شەقامە بەردەوام ئۆتۆمبێلی پێدا دەڕۆیشت،

دەیزانی تاوەکوو ناو بازاڕ و دەوری قەڵاتێ دەبێ ڕێگایەکی دوور ببڕێت و بەو کۆڵان و شەقامە چۆڵانەدا بڕوات.

ئەو دوو ڕۆژە ئەوەندە خۆڵ بارییبوو، شۆستە و ڕاستەشەقامەکەت بۆ لێک جیا نەدەکرایەوە، لە هەندێک شوێن دەنکە زیخە وردەکان لەبەر تیشکی خۆرەکەدا شەوقیان دەدایەوە، وەکوو زێڕ بەو ناوەدا بارییبوون. ئەو ڕیزە درەختەی لەسەر شۆستەکانی نێوان ئەو شەقامەدا ڕوابوون کە درەختی قەڵەمتۆز بوون، لە بێئاویدا سیس و بێ گەڵا دیار بوون، ئەوەندە تۆزیان لەسەر نیشتبوو، لە دڕکی حوشترخۆرەی بیابان دەچوون. مەستوورە هەمان ڕێگای گرتە بەر کە ڕۆژانە لێوەی بۆ بازاڕ دەچوو، زوو زوو بۆ بەردەم ماڵەکان لای دەدا و لەسەر دیوارەکانەوە لەناو حەوشەکانی دەڕوانی، بە مشتەکۆڵەی لە دەرگا ئاسنە تۆزاوییەکانی دەدا و بانگی دەکرد: "ماڵەکە! ماڵەکە، کەستان لە ماڵە؟"

لەسەر شەقامە سەرەکییەکان و لەسەر کۆڵانەکان دەبابە وەستابوون، سەربازێک یان دووان لەسەر دەبابەکان دانیشتبوون و قسەیان دەکرد. کە مەستوورە تێدەپەڕی، لێیان دەڕوانی و هەندێکیان سڵاویان لێ دەکرد، هەندێک لە ماڵەکان دەرگاکانیان کراوە بوون و جێپێ لەسەر خۆڵە بارییوەکە دیار بوو. پێش ئەوەی بگاتە سەر ئەو ڕاستەشەقامەی بۆ بەر قەڵاتێ دەچوو، بۆ بەردەم ماڵەکانی گەڕەکی کۆماری پەڕییەوە. دووکانێک هێشتا کەلوپەلەکانی لەسەر شۆستەکە بوون، سندووقی سەوزە و میوەکان ئەوەندە خۆڵ لەسەریان بارییبوو؛ سێو و پرتەقاڵەکانی

شــاردبووەوە. لەناو دووکانەکەوە دەنگێکی پچڕ پچڕی دەبیســت. مەستوورە چووە ناو دووکانەکە و چەند جارێک بانگی کرد، لەگەڵ دەنگی ئەودا و لەناو ماڵەکانی گەڕەکی کۆمارییەوە دەنگی گوللە دەبیستران. وەکوو لە دەنگی گوللەکان ڕاچڵەکیبێت، خۆی لەپشت ڕەفەیەکی ناو دووکانەکەدا شــاردەوە و بێدەنگ بەســەر ڕەفەکەدا لـە دەرەوەی دووکـانـەکـەی ڕوانی. ســـــەری گێژی دەخوارد و هەناســەبڕکێی پێکەوتبوو. ناو ڕەفەکان بەتاڵ دیار بوون و لەسـەر زەویی دووکانەکە کەرەســـــتەی جۆراوجۆر کەوتبوون، گڵۆپەکان هێشتا دەگڕان، لە پێشەوەی دووکانەکەدا ڕادیۆیەکی ڕەش لەسەر مێزێک دانرابوو، کورسـییەکی زەردی پلاسـتیکی لە پشـتیەوە بوو، دەنگی ڕادیۆکە بە پچڕ پچڕ دەهات و هەندێک جار خشــەخشــی بوو: "*...بۆ ئێمـەیـە، عێراق، نـەتـەووووو... ە... ی عـەرە... عـەرە... بببببببببب...*"

مەسـتوورە چوو لەسـەر کورسـییەکە دانیشـت و دەسـتی برد میلی ڕادیۆکـەی بـا دا، لـەو کـاتـەدا بێژەرێـک: "*...مووومـان یـەک پەیاممان هەیە، چونکە ڕاسـتی لای ئێمەیە، سـەرکەوتن بۆ ئێمەیە، خوا پشـتیوانی ئێمەیە. لە ڕۆژێکی وەکوو ئەمڕۆدا هێزەکانی سـەر بە سوپای نیشتمانی تەواوی شار و گوندەکانیان لە یاخیبووەکان، ســـەگ و گورگە دڕندە کێوییەکان، بەکرێگیراوانی بێگانە، پاک کردەوە. سـەروەری بۆ عێراق و سـەرۆکەکەی، سـەرشـۆڕی بۆ دوژمنانی گەل. خوا گەورەیە! خوا گەورەیە!*"

"خوا گەورەیە خوا گەورەیە، قســـەی قۆڕ، ئینجا ئەو خەڵکە قوڕبەســـەرەیش زوو زوو دەڵێن خوا گەورەیە، ئینجا دەبێت ئەو خوایە پشتیوانی لە کێ بکات!"

کاتێک مەستوورە ئەمەی بە دەنگێکی پچڕ پچڕ وت، دەمی خوار کردبوو، وەکوو بیەوێت لاســـایی بێژەرەکە بکاتەوە. هەڵســـابووە ســـەر پێ و تاوێک لە ڕادیۆکە دوور کەوتبووەوە، کە لەو کاتەدا چەندین دەنگی ژن و پیاو بە کۆرس نەشـــیدێکیان دەخوێند، توند دەســـتی بە گوێکانیەوە گرت و چوو خێرا ڕادیۆکەی کوژاندەوە. لە دەرەوەی دووکانەکە دەنگی گوللەکان لە زیادبووندا بوون، وەکوو هێزی شـــریخەی گوللەکان بەناو ئێســـقانەکانیدا تێپەڕیبن. نەیدەتوانی خۆی بەپێوە بگرێت، دەستی بە قەراغی مێزەکەوە گرت و پاشـــان لەســـەر زەویی دووکانەکە دانیشـــت، بە دەنگی بەرز دەگریا، زوو زوو بەدەم گریانەوە: "دەنگی ئەو گوللانە... وەی لە خۆم ڕۆ، لە خۆم ڕۆ، خەمی ئەو ترسەم جەرگی بڕیوم!"

لەگەڵ دەنگی لاواندنەوەکەی ئەودا، تاوەکوو دەهات دەنگی گوللەکان زیاد دەبوو، دەســـتی بە قەراغی مێزەکەوە گرت و خۆی ڕاســـت کردەوە، کاتێک بەســـەر قۆڵی پاڵتۆ ســـەوزەکەی؛ چاوە تەڕەکانی ســـڕی، ڕادیۆکەی خســـتە بنباڵی و بەکووڕەکووڕ لە دووکانەکە چووە دەرەوە، لەســـەر شـــەقامەکە لەگەڵ دەنگی دەســـترێژیی گوللەکاندا لوورە و واقەی چەقەڵەکانی دەهاتە بەر گوێ، شوێنەواری چنگ و پێکانیان لەسەر خۆڵە باریوەکەی سەر شـۆشـــتەکان دیار بوو، دەنگی بێژەری ڕادیۆکە بەردەوام لەناو گوێکانیدا دەزرینگایەوە و تێکەڵ بە دەنگی گوللەکان و لوورەی

چەقەڵەکان دەبوو، لەژێر لێوەوە وتی: "خوا گەورەیە! خوا گەورەیە!"

تۆنی دەنگی بێژەری ڕادیۆکە، دوا سات و ڕۆژی گوندی جەلەمۆردی بیر خستەوە. بێژەری ئێزگەی دەنگی ڕادیۆی بەغداد کە خدری مێردی بەردەوام گوێی لێ دەگرت، بەتایبەتی ئەو شەوەی کە ویستیان بڕۆن و خۆیان بشارنەوە، زوو زوو مەستوورە و کچەکانی پرسیاریان لە خدر دەکرد ئاخۆ چیی گوتووە و حکومەت بڕیاری چیی داوە. خدر کابرایەکی کەمدوو بوو، هەروەها پێی وا بوو ئەو هەواڵانە پێویستە تەنها پیاو بیانزانێت، چونکە تەنها پیاو دەتوانێت لێیان تێبگات. پاشان پێش ئەوەی خدر ڕادیۆکەی بگۆڕێتە سەر ئێزگەی گەلی کوردستان، لەبەر خۆیەوە بە مەستوورە و کچەکانی گوت: "هیچ نییە! باوەڕ ناکەم جەیش ڕوو لە ناوچەی ناوشوان بکات!"

ڕۆژی پێش ئەو شەوە، خەڵکی ئاوایی جەلەمۆرد کۆ بووبوونەوە و بڕیار درا خۆیان ڕادەستی حکومەت نەکەن، بەرەو چەمی بابەرووشە بڕۆن و لەوێ خۆیان بشارنەوە. هێشتا خدر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە پێویست بە خۆشاردنەوە ناکات، چونکە حکومەت بەنیازی هێرش نییە. خدر ڕادیۆکەی بە بناگوێیەوە نابوو، دوو شەو بوو خەون نەچووبووە چاوی و بەردەوام بەدیار ڕادیۆکەیەوە دانیشتبوو. کاتێک مەستوورە کچەکانی لە خەو بەئاگا هێنا، تەنها ئەوەندی پێ گوتن: "دەی... دەی کچەکان دەستوبردی لێ بکەن با بڕۆین!"

کاتێک مەســـــتوورە و خدر لە بەرهەیوانەکە ڕاوەســـــتابوون، خەڵکی ئاوایی ســێ بەشــیان گەیشــتبوونە پشــتی ئاوایی و بگرە هەندێکیشیان لە یاڵ چووبوون بەودیودا. مەستوورە چەند جارێک بانگی لە کچەکانی کرد، کاتێک یەک یەک هاتنە دەرەوە و ڕووناکیی چرا فانۆسەکەی دەستی؛ لێی دان، خدر بە دەنگی بەرز پێی گوتن: "دەک قوڕ بەســــەر خۆم، ئەوە دەڵێی بە ناخێری گیانتان بۆ زەماوەند خۆتان گۆڕیوە!"

مەســـــتوورە ویســـــتی پێیان بڵێت کە دەچین لەو کێو و هەردە خۆمان دەشــارینەوە و پێویســت بە خۆگۆڕین ناکات، بەڵام چاوی پڕ بوو لە فرمێســک و گریانێک قورگی گرت و هەناســەبڕکێی پێ کەوتبوو، کە ڕێگەیان پێ نەدا نیازی دڵی خۆییان پێ بڵێت. دەستی خستە سەر شانی خدری مێردی و توند گوشیی، کاتێک خدر لە مەستوورەی ڕوانی، ئەویش ســەری لێ ڕاوەشــاند، ئیتر خدر لە مەبەســـــتی ژنەکەی تێگەیشـــــت و ڕادیۆکەی هەڵبڕی و نای بە گوێیەوە. لەو کاتەدا مەلا مســـــتەفا لەناو دەرگاکەوە بانگی لە خدر کرد. کاتێک ئەوان پێکەوە گوێیان لە ڕادیۆکە دەگرد، مەســـــتوورە یەک یەک بەســـەر کچەکانیدا گەڕا. بەهاری کچەگەورەی لەچکێکی ســـــووری بە ســـــەردا دابوو، ڕەنگی قژی و لەچکەکەی زۆر جیاوازییان نەبوو، پێستی سپی و گلێنەی چاوی سەوز بوون کە لەو تاریکییەدا ڕووناکییەکی کەمی پێویست بوو تاوەکوو ببینرێت. مەستوورە سەر شانی هێلەکە سەوزەکەی بۆ ڕاست کردەوە و دەستی بەســەر ســنگیدا هێنا، خۆی لێ نزیک کردەوە و پێی گوت: "دەڵێی هاتوونەتە خوازبێنیت؟"

"ئیتر دایکە گیان کە بەخت ڕووی تێ کردیت، شەو و ڕۆژی بۆ نییە!"

"کام بەخت؟"

"بەختی شوو!"

هەر چوار کچەکەی مەستوورە، یەکی چڵێک دارمۆردیان بە دەستەوە بوو کە ئەوەندەیان لە سەر سنگ و جلەکانیان هەڵسوییبوو، بۆنی دارمۆردیان لێ دەهات. مەستوورە چراکەی دەستی تاوەکوو ئاستی دەموچاوی کچەکانی هەڵبڕی و چاوی پێدا گێڕان، دەستی برد و قۆپچەی سوخمەکەی ژیانی کچە بچووکی ترازاند: "ئیتر با سنگ و مەمکی تۆش دەربکەوێت، نەوەکوو بەختەکەی تۆش لەبەر دەرگا بێت!"

پێکەوە دەستیان کرد بە پێکەنین: "دەی خوا بەدڵی ئێوەمان لەگەڵدا بکات!"

پاشان مەستوورە لە بەری پێیەوە تاوەکوو سەر سنگی لە خۆی ڕوانی، نێرگز و کوێستان دەستی دایکیان گرت و داوایان لێ کرد خۆی بگۆڕێت. پێش ئەوەی کچەکانی لە خەو هەڵسێنێت، لە گەوڕەکان گەڕابووەوە، ئالیکی دوو ڕۆژی بۆ مەڕ و بزنەکانی دانابوو. زۆربەی خەڵکی جەلەمۆرد ئێوارەی ڕۆژی پێشوو مەڕوماڵاتیان لەناو دێ دەرکردبوو، بەڵام خدری مێردی بەگوێی خەڵکی ئاوایی نەکردبوو. مەستوورە هێشتا جزمە شینەکانی لە پێدا و شەرواڵێکی خدری لەپێ کردبوو، لەو کاتەدا مەلا مستەفا و خدری مێردی بانگیان لێ کردن. مەستوورە چارەکەیەکی پڕ کردبوو لە نان و توورەکەیەک هەنجیری وشکی خستبووە ناو

چارەکەکە. خدر و مەلا مستەفا بەدەم قسەکردنەوە گەیشتبوونە پشتی ئاوایی، لەو کاتەدا تراکتۆرێکی بێ لایت لەبەردەم ماڵی مەستوورە وەستا، زیاتر لە بیست منداڵ و ژن و پیر و گەنجی تێدا بوو، پیاوێک بەسەر تراکتۆرەکەوە ڕووناکیی لایتەکەی دەستی گرتە مەستوورە و کچەکانی، پاشان دابەزی و بۆ لایان هات، لەبەر ڕووناکیی لایتەکەیدا لە کچەکانی مەستوورەی ڕوانی، گوتی:

"ئەرێ کەنیشک، ئەوە خێرە وا خۆتان گۆڕیوە؟"

پیاوێکی تەمەن سی ساڵ دەبوو، قژ و ڕیش هاتوو، پاڵتۆیەکی سەربازیی سەوزی لەبەردا بوو، مەستوورە لێی چووە پێشەوە:

"ئێوە چ کارەن؟"

"ئێمە لە گۆپتەپەوە هاتووین، کوڕە قەستەم بە خوا جەیش و جاش دەست لە کەس ناپارێزن، ئەوەتا لە ئاوایی ئێمە دەرمانیشیان پیا کردووین!"

"دەرمان! دەرمانی چی؟ کوڕە وا نەڵێیت!"

"قیامەتێ هەڵسیاوە، زەلام ژیان دەرنابات و تەنانەت پەلەورەکانیش فریای فڕین ناکەون!"

دوای ئەوەی مەستوورە ئەمەی لە کابرا بیست، پشتی کردە کابرا و کچەکانی پێش خۆی، بەردەوام دەستی بە پشتیانەوە دەنا، زوو زوو لەبەر خۆیەوە پێی دەگوتن: "دەی! دەی خێرا کەن!"

"ئەی خەڵک ئەم ئاواییە هان لەکوێ؟"

"لەودیو ئەو یاڵە، لەو چەمەی بابەرووشەن!"

مەستوورە کاتێک ئەمەی وەڵامی کابرا دایەوە، ئاوڕی لێ نەدایەوە و زیاتر لە بیست مەترێک لێی دوور کەوتبووەوە.

مەستووره دیسان بەدەم ئەم خەیاڵانەوه بۆ گەڕەکی ئیسکانی کۆن و بۆ بەردەم بارەگای یەرمووکی حیزبی بەعس هاتبوو، بەرامبەر باڵەخانەی بارەگاکه ڕاوەستابوو، وەکوو هێشتا لەبەر خۆیەوه لەگەڵ کچەکانیدا بدوێت، کلیلی ئەپارتمانەکەی و ڕادیۆکەی به دەستەوه بوو، هەستی دەکرد گڕه و خۆڵبارین هەموو شتێکی لەو شاری هەولێرەدا بێڕەنگ کردبوو. بینیی ئاڵای سوور و سپی و ڕەش له سەربانی بارەگای یەرمووک و پۆلیسخانەکه هەڵکرابوون و دەشەکانەوه، دوو سەرباز بەبەردەم بارەگاکەدا پیاسەیان دەکرد، چەقەڵەکانی له کۆڵانەکانی ئیسکانی کۆندا دەبینی، هەندێک جار لەبەردەم بارەگاکه ژنه ڕەشپۆشەکانی دەهاتنەوه پێش چاو، پاشان پێش ئەوەی بڕوا، وەکوو هەموو جارەکانی تر چاوی به نووسینی سەر دیوارەکاندا گێڕا، لەبەر خۆیەوه و لەژێر لێوەوه بەحونجه خوێندیەوه: *"بژی سەرۆک"*

## ١٨

ئێوارەی ئەو ڕۆژە و پێش خۆرئاوابوون. هێشـــتا ڕادیۆکەی بەدەســـتەوە بوو بە کۆڵانەکانی ئیســـکاندا دەگەڕا، بە کلیلەکانی دەستی لە دەرگا و پەنجەرەی ماڵەکانی دەدا. باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیسکان سێ نهۆم بوون و لەو باڵەخانەیەدا ماڵی سمایلی حەماڵ و مەجیدە شەل؛ سەر و خواریان لە مەستوورە گرتبوو. دەرگا و پەنجەرەی هەندێک ماڵ لەســـەرپشـــت بوون و ڕەشـــەبا خۆڵی بۆ ســـــەر ڕاخەر و ناو نوێنەکانیان بردبوو، لەهەر جێگایەک دەنگێک بهاتایەتە بەر گوێی، خێرا بانگی لە مەجید یان پشیلەکەی دەکرد.

مەســـــتوورە گەڕابووەوە ماڵەوە و بێدەنگ لەســـــەر قەلاتێی دەڕوانی، شووشەیەکی مرەبای سێوی هەڵپچڕیبوو، بۆنی ئەلکهول و بۆگەنی ســـێو؛ ژوورەکەی پڕ کردبوو، هەســـتی بە کاریگەری مرەباکە دەکرد و بەرچاوی تاریک دەبوو، لەدوور خەڵکی لێوە

دیار بوو کە بۆ ڕۆژی مەولوود بە قەدپاڵی قەڵاتێدا هەڵزنابوون، زوو زوو کەوچکێک مرەبای سێوی دەخوارد. پاش کاتژمێرێک خۆی بەپێوە بۆ ڕاگیر نەدەکرا، پاشان لە خەیاڵی خۆیدا ئاوای گوت: "ئەمشەو لە سەر قەڵاتێ شتێک ڕوو دەدات، ئەگەر بێتوو دۆعای ئەو خەڵکە مسوڵمانە گیرابێت!"

پاشان لەسەر زەوییەکە دانیشت و یەکێک لە سندووقە تەختە سەوزە سەربازییەکانی لەژێر تەختی خەوەکەیەوە بۆ ناوەڕاستی ژوورەکەی ڕاکێشا. کاتێک سندووقەکەی کردەوە، چاوی چووە سەر ماکسییە سوورەکەی، ئەو ماکسییەی بایزی مێردی هەرەشەی لێ کردبوو کە لەبەری نەکات، دەریهێنا و بە دەستیەوە گرتی، لەسەر ڕانی داینا و لەو دوو جێگایەی ڕوانی کە قرنجابوون و لەسەر ئەژنۆکانی دەیان کونی وردی تێدا بوو، هێشتا جێگای چەند پەڵەخوێنێکی وشکی پێوە مابوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەو ڕۆژەی بە ناخێری گیانم بۆ هەنجیر کرین چووبووم!"

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەردەوام بوو: "کوڕە نەمزانی خواردنی ئەو مرەبای سێوە ئاوا هۆشم لەبەر ناهێڵێت و ئەو کەتنەم پێ دەدات، چۆن ئا بەم ماکسییە تەنکەوە گەیشتبوومە ناو بازاڕ، ئەوەندەی لەبیرم بێت کاتێک گەیشتمە سەر ڕاستە شەقامی بەرامبەر قەڵاتێ، ئەو کوڕوکاڵەم وەکوو شارەزەردەواڵە لێ ورووژان، وەکوو سەربازەکانی حکومەت دەهاتنە پێش چاوم، هەموو وەکوو چەقەڵ چاویان زەق دەرپەڕیبوون و لە مذیان ڕوانی، بە خوا لیک بە دەمیاندا دەهاتە خوار، بەو بێهۆشییەمەوە بۆنی ناوگەڵیانم دەکرد، بۆنی ساردی شەهوەتیان بە دیواری

ســــییەکانمەوە نووســــابوو، تا چەند ڕۆژێکیش لە لووتمدا نەدەڕۆیشـــت، وا بزانم زیاتر لە دە گەنج دەســـتیان بۆ مەمک و سمتم بردووە، دووکاندار و مشتەری هاتبوونە سەر شۆستەکان و هەر چاوێکیان کردبووە دوو چاو، ئیتر نازانم ئەو ڕۆژە خەتاکە لە منەوە بوو یان ئەو خەڵکە لەگەڵ بینینی هەموو ئافرەتێکدا ئاوا بوون. زۆر ترسـام، مەگەر ئەو ڕۆژە ئەوەندە ترسـابم کە قاسـم ئاغا و پیاوەکانی لە نیوەشـەودا بۆ ناو ئاوایی جەلەمۆرد هاتبوون، ئەوە نزیکی ســـاڵێک پێش لێقەومانە گەورەکە بوو. بەبیرم دێت باوکم لە ترسـی قاسـم ئاغا و پیاوەکانی، من و دایکمی لە گەوڕی بزنەکان شـاردەوە، دایکیشـم گووی سـەگەکانی لە لامل و سـەر سنگ و ناوگەڵی هەردووکمان هەڵسووی، ئەو بۆنەی ئێستاش بە سییەکانمەوە لکاون. تاوەکوو ئەمڕۆش کاتێک ترسێکی لەو جۆرەم لێ دەنیشـێت، لە کاتی هەناسـەداندا ناو قوڕگ و لووتم لە بۆگەنی گووی سەگەکان پڕ دەبێ. هەرچ کاتێک بیر لە پیاو دەکەمەوە، ناو دەمم پڕ دەبێت لە بۆگەن. کاتێک لەگەڵ خدر و شـــێخ بایزیشـــدا دەنووستم، بۆنم دەکرد. ئەو ڕۆژە لەو شەقامەی کن قەڵاتێ هەمان هەستم هەبوو، بەترسـەوە خۆم ڕاسـت کردبووەوە و لە دەوری خۆم دەڕوانی، بۆ ئەوەی پیشـــانیان بدەم کە لێیان ناترســـم، لە بێبەختیمدا نووکی پێم لە قەراغی شـۆسـتەکە هەڵکەوت و لەسـەر دەم کەوتم، لەپێش لەپی دەســـتمەوە هەردوو ئەژنۆم بەر کاشـــییەکان کەوتن، ئەوەندە ئازاریان دەهات تاوێک لەوێدا کەوتبووم و نەمتوانی ڕاســـت بمەوە، گوێم لە هاوار و پێکەنین و فیکەلێدانی ئەو خەڵکە بوو، ئەو هەموو کوڕە گەنجە دەورەیان لێ

دابووم و پێم پێدەکەنین. کە سەرم هەڵبڕی و لێم ڕوانین، وا بزانم لێیان پاڕامەوە، پاشان کە زانیم کەسیان گوێیان لە قسەکانی من نییە، لە بێدەسەڵاتیمدا بە دەنگی بەرز دەستم کرد بە گریان. وەکوو شارەهەنگ دەورەیان لێ دابووم و هەریەکە و بەدەم پێکەنینەوە شتێکی دەوت،ماڵی ئەو دوو پیاوە ئاوا بێت هاتنە ناو خەڵکەکە و دەستیان نایە بنباڵم، گوێم لێیان بوو بە خەڵکەکەیان دەوت: 'گوناحە! گوناحە، مەزڵوومە، وازی لێ بێنن!' ئەو قسەی باوکم زوو زوو دەیکرد، کە من و دایکم لەپێش چاوی باوکمدا مەزڵووم بووین و جێگای بەزەیی بووین، وا بزانم ئەو دوو پیاوەش لە تەمەنی ئەوسای باوکمدا بوون، کە تەمەنیان سەر و پەنجا ساڵێک دەبوو. لە کوڕە گەنجەکان تووڕە بوون و بە پاڵ ڕێگایان کردەوە و ڕزگاریان کردم، هەر دە مەترێک دوور لەو جێگایە بردمیانە دووکانێکی کوتاڵفرۆش، لەسەر کورسییەک دایاننام و پەرداخێک ئاویان دایە دەستم. کاتێک پەرداخە ئاوەکەم خواردەوە و باش لێم ڕوانین، باڵا و شێوازی دەموچاویان و سەریان بە ئەندازەیەک لێی سپی بوو، تەنها بە جلەکانیاندا لێک جیا دەکرانەوە. یەکێکیان لێی ڕوانیم و وتی: 'تۆ گوناحیت، ئەو خەڵکە خوانەناسن!' ئەوی تریان بۆی سەندەوە و گوتی: 'دەی ئافرەتێکی شۆخوشەنگی وەکوو تۆ، بۆ تۆزێک بە پۆشتەوپەرداخی نایەیتە ناو بازاڕ! ئەو خەڵکە ناهەقیان نییە.' لێم هاتبووە پێشەوە و لە کاتی قسەکردندا پەرداخەکەی بەبەتاڵی لە دەست وەرگرتم، لەو کاتەدا بۆنێک بەر لووتم کەوت و هەناسەی توند کردم، بۆنی ئەو دوو پیاوە کە بۆنی گووی سەگیان لێ دەهات، جا ئیتر نازانم

شـــوێنەواری بۆگەنی ناو ســـیەکانی خۆم بوون یان بۆنی ڕاسـتەقینەی ئەوان بوو! ئەوی تریان لە دووکانەکە چووە دەرەوە و گوێم لێ بوو هاواری بەسەر خەڵکەکەدا دەکرد کە هێشتا لەسەر شـەقامەکە چاوەڕوانی منیان دەکرد. ئەو پیاوەی بەدیارمەوە بوو، دەموچاوی هێنایە پێشـــەوە و پێی گوتم: 'ئەگەر خۆت قوزت نەخورێت، ئاوا بەڕووتی بۆ ناو ئەو قەرەباڵغییە نایەیت!' کاتێک ئەوەی پێ وتم، دیسان هەناسەی هات بە سەرمدا، منیش هەستام و داوام لێ کرد: 'دەی خێرت دەگاتێ ئەگەر تاوەکوو ســـەر شـەقامەکە لەگەڵم بێیت، بەشکم بچمە ناو تاکسییەک!' شانی گرتم و خێرا پێش خۆی دام: 'بڕۆ پێشم بکەوە، لەبەر ئەوەی زۆر زەلیل دەتبینم و بەزەییم پێتدا دێتەوە.' کاتێک هاتینە بەر دووکانەکە، هێشـتا ئەوی تریان لەگەڵ کۆمەڵێک گەنجدا کە ژمارەیان بیسـت کەسـێک دەبوو، لە لێدوان و شـێوە شـەڕدا بوو. ئەو کابرایەی دەسـتی بە باڵمەوە بوو، بردمیە سـەر جادەکە، پاشـان دەسـتی لە تاکسـییەک ڕاگرت. کاتێک تاکسـییەکە لە بەردەمماندا ڕاوەسـتا، دەرگای دواوەی بۆ کردمەوە و چوومە ناو تاکسـییەکەوە. شۆفێرەکە کابرایەکی سەرڕووتاوەی بچکۆلانە بوو، لە ئاوێنەکەوە چەند جارێک لێی ڕوانم و بەخێرهاتنی کردم. پەنجەرەکانی لای ڕاسـت و چەپی دواوەی تاکسـییەکە داخرابوون، تەنها ئەوەی لای شـــۆفێرەکە کراوە بوو کە خۆی قۆڵی لێوە دەرهێنابوو. کاتێک خەڵکەکە هاتن لەملا و ئەولای تاکسـییەکەوە وەسـتان، شـۆفێرەکە شـووشـەکەی لای خۆیشـی داخسـت، پاشـان بەئەسـتەم گوێم لە هاوار و فیکەلێدانی دڵخوازەکانم بوو. شـــوفێرەکە خۆی دابوو

بەسەر کوشنەکەدا و دوای ئەوەی لە سەرئەژنۆ خوێناوییەکانمی ڕوانی، سەری هەڵبڕی و پرسیی: 'بۆ کوێ بڕۆین؟'

'شوقەکانی ئیسکان.'

مەستوورە لەبەردەم ئاوێنەی گەرماوەکەی، ماکسییە سوورەکەی بە باڵای خۆی گرت: "ئەرێ زۆر کورت و تەنکە، نازانم ئەو ڕۆژە چۆن وێرابووم بەو جلکەوە بۆ بازاڕ بچم، خۆ ئەو خەڵکە ناهەقیان نەبوو، باشیشە کە بەو ڕۆژی نیوەڕۆیە سواریشم نەبوون!"

ماکسییەکەی خستەوە ناو سندووقەکە و دایخست، لەژێر کەوانتەری مەتبەخەکەی چەکوشێکی هێنابوو، بەسەر سندووقەکەی ترەوە وەستا و قوفڵەکەی شکاند، پێشتر لە ترسی شێخ بایز نەیدەوێرا دەستکارییان بکات. کاتێک کردیەوە، قاتێک جلی کوردی لە سەرەوەی دەرکەوت. لەبەردەم سندووقەکەدا هاتبووە سەر چۆک. قاتێک جلی زەردباوی شاڵ و پشتێنێکی ڕەش کە گوڵی زەردی تێدا بوو. کاتێک جلەکانی دەرهێنا، لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەوەتا، جلی کوڕێنییەکانی بایزن!"

دەستی بە دەمیەوە گرتبوو، لەناو سندووقەکەی ڕوانی، دوو تفەنگ و فیشەکدان و دەمانچەیەکی ڕەش و کیسەیەکی بۆریی پێچراوەی تێدا بوو، کیسەکە مەدالیایەکی زەردی ئاڵتوون و کاغەزێکی تێدا بوو، مەدالیاکە سەری داڵێکی لەسەر هەڵکەنرابوو، بە پەتێکی سوور و ڕەشەوە بوو. چەند هەناسەیەک بێدەنگ لە

کاغەزەکەی ڕوانی، چاوی چووە سەر چەند وشەیەک و ویستی حونجەیان بکات: "ش-ج-ا-ع... ح-ر-س... و-ط-ن..."

وشەکانی بەنیوەناچڵی دەخوێندەوە، پاشان لە خۆی پرسی: "دەی بۆچی من ئەو هەموو ساڵە خەیاڵم لای ئەو سندووقە نەبووبوو؟ بۆ بە ناخێری گیانم پێشتر نەمکردەوە؟ ئەو هەموو ساڵە ئەو بەڵایە لەژێر قنگی مندا بووە و پێم نەزانیوە!"

## ١٩

ئـەو خۆڵـەی بەســـــەر شـــــاری هەولێردا بـاریبوو، لـەنێوان باڵەخانەکانی ئیســـکاندا گردۆڵکەی بەرز و نزمیان لە لم دروســـت کردبوو. لە دوور و لە سەر سەربانی ماڵەکانی سەیداوەوە دیسان دووکەڵێکی ڕەش دیار بوو، کە دووکەڵی ئاگرەکەی ســـەر قەڵاتێ بوو. ســەربازەکان بەناو کۆڵانی گەڕەکەکاندا دەسـووڕانەوە، چەند سەربازێک لەناو شوقەکانی ئیسکان هەڵوێستەیان کرد و سەریان هەڵدەبڕی و گوێقوڵاخ لە مەستوورەیان ڕوانی، کە لەوکاتەدا لەبەر پەنجەرەکەدا ڕاوەسـتابوو، دەسـتیان بەرز کردەوە و سـڵاویان لێ کرد، ئـەویش پـەردەکـانی دادابوونـەوە، بـەردەوام پۆلێـک داڵ بـە بەرزییەوە بەسەر باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیسکاندا دەگەڕان.

مەسـتوورە جلەکانی داکەندبوو، تەنها ژێرکراسـێکی جەلسـەی سـپیی لەبەردا مابوو، لەتەنیشـت جێگای خەوەکەیدا وەسـتابوو، لە

جلەکانی شێخ بایزی ڕوانی، نێوان ڕانەکانی شوێنەواری خوێنیان پێوە بوو، لە کەنتۆری جلەکانی پارچەیەک قوماشی سپیی دەرهێنا و قەدی کرد، پەڕۆ سپییە قەدکراوەکەی لە ناوگەڵی ئاخنی: "مەگەر ئەمە بەر بەو دڵۆپەی خوێنانە بگرێت، ئەوەندەم دەسەسڕی کلێنس تێ ئاخنیوە، لچ و لێوی دەکزێنەوە!"

جلەکانی شێخ بایزی لەبەر کردبوو، چووبوو لەبەر ئاوێنەی گەرماوەکەیدا ڕاوەستابوو، پشتێنەکەی چەند جارێک کردەوە و دیسان بەستیەوە، دەیویست وەکوو شێوازی شێخ بایز بیبەستێت. قژی خستە ژێر کڵاوەکەیەوە و جامانەکەی لەسەر کڵاوەکەوە لە سەریەوە پێچا: "ئەوەش پیاوی دەوێت، جا لەبەر ئەوەی شوکور من پیاو نیم، نازانم چۆن خۆم بگۆڕم!"

زەردەخەنەیەک هاتە سەر لێوی: "کتومت لە خۆی دەچم. دەی مەستوورە، عەمرت نەمێنێت بۆ چ پیاوێکیت!"

قاقا بە خۆی پێدەکەنی. مەستوورە کاتێک ئەمەی گوت، لە ئاوێنەکەدا بەسەرنجەوە لەنێو چاوی خۆی ڕوانی، پاڵتۆ سەوزەکەی لەبەر کرد و تفەنگەکەی شێخ بایزی کردە شانی، جزمەکانی لەپێ کرد و وەکوو پەلەی بێت؛ خێرا لە ماڵ چووە دەر، دەرگاکەی بە کلیل لەدوای خۆیەوە داخست، لەبەر دەرگای ئەپارتمانەکەیدا ڕاوەستا، دوای ئەوەی سەیری تفەنگەکەی دەستی کرد، بیری لەوە دەکردەوە کە ئەگەر پێویست بکات داخۆ دەتوانێت تفەنگەکە بتەقێنێت؟ ڕووی لوولەی ئەو تفەنگە بکاتە کێ؟ دەی لە ترسی دەنگەکەی، چی بکات؟ لەم بیرکردنەوانەدا بوو، بەتایبەتی خەیاڵی لای تەقەی تفەنگەکە بوو.

بایەکی وشک و گەرمی دەهات و ئەو ناوە خۆڵ دایپۆشیبوو، بە دەســـتێکی ئارەقەی ناوچەوانی ســـڕی، لەو کاتەدا لەدەوری باڵەخانەکە چەقەڵەکانی بینی. مەستوورە لەسەر پلیکانەکان دانیشت و ڕووی لوولەی تفەنگەکەی لە دەرگای باڵەخانەکە کرد، لەودیو دەرگاکەوە گوێی لە واقەی چەقەڵەکان بوو، لە تفەنگەکەی دەســتی ڕوانی، لەناکاو فیشـــەکێک لە لوولەی تفەنگەکەوە دەرچوو. لەگەڵ دەنگەکەدا، قیژەیەکی کرد. بێ ئەوەی لە دەرگای ئەپارتمانەکە بڕوانێ و بزانێت فیشـــەکی تفەنگەکە بەر کوێ کەوتووە، خێرا هەستا و بەڕاکردن بەرەو سەرەوە چوو. تفەنگەکەی لەو جێگایەی لێی دانیشـتبوو، بەجێ هێشـت. چەند پلیکانەیەک سـەروو تفەنگەکە؛ کڵاو و جامانەکەی کەوتبوو، بەدەم ڕێگاوە پشـتێنەکەی کرابووەوە و بە دەســـتێکیەوە گرتبووی، دەســـتەکەی تری بەردەوام بەســـەر دڵیەوە بوو، چاوی پڕ بووبوو لە فرمێســک و ســەر ڕوومەتی تەڕ بوو. گەیشـــتەوە بەر دەرگای ئەپارتمانەکەی و چەند جارێک هەناســـەی قووڵی هەڵکێشـــا، لە گیرفانی پاڵتۆکەیدا لە کلیلەکان دەگەڕا، بە چواردەوری خۆیدا ڕوانیی و دایە پرمەی گریان.

لـــە چوونەژوورەوەیـــدا لـــە ڕێوە چـوو بۆ مەتبەخەکەی و بـەلوعـەکـەی بـەر دایـەوە، دوای ئـەوەی چـەنـد گوێلێک ئـاوی خواردەوە، پاشـــان ســـەری خســـتە بەر بەلوعەکە، چوو لەســـەر لێواری تەختی خەوەکەی خاولییەکی لە سەریەوە پێچا و دانیشت، بێدەنگ لە پەردە دادراوەکەی ڕوانی، لەســـەرپشـــت پاڵ کەوتبوو، هەردوو دەستی لەسەر سنگی دانابوو: "بەم پاشەڵە گواوییەمەوە،

ئەو چەقەڵانەم لەم شـارە پێ دەرناکرێت. دەسـتەپارچەم و هیچم پێ ناکرێت!"

تەقەی تفەنگەکە خەیاڵی شـێواندبوو، نەیدەتوانی بیر لە هیچ بکاتەوە، تەنها ناڵەی تفەنگەکە نەبێت بەردەوام لە مێشـکیدا دەزرنگایەوە. وێنەی چەقەڵەکان و دانەجیرەیان لەپێش چاوی لا نەدەچوو. دوو کاتژمێر دەبوو پاڵ کەوتبوو.

دوای ئەوەی هەڵسـا و چوو لە گەرماوەکە لەبەر ئاوێنە درێژکۆڵەکەدا ڕاوەسـتا، ئەو ئاوێنەیەی کە دەتوت بە باڵای خۆی براوە، لە خۆی ڕوانی و لە خەیاڵی خۆیدا: "هەموو پەنجەداگرتنێک لەسـەر پەلەپیتکەی ئەو تفەنگە، فیشـەکێک دەردەچێت و ئەو دەنگە نەگریسـەی لێوە دێت. ئەو دەنگەی لە منداڵیمەوە پێی ڕانایەم، ئیتر لەگەڵ بیستنیدا ڕۆحم لەناو جەستەمدا باڵ دەگرێت و بێزار دەبێ!"

چەند جارێک بەدەم هەنسکهەڵکێشانەوە: "ئەو شارە..."

قسەکەی تەواو نەکرد و گەڕایەوە ناو خەیاڵی خۆی، لە ئاوێنەکە نزیک بووەوە و لە چاوی خۆی ڕوانی و لە خەیاڵی خۆیدا: "تۆ قوڕت بەسەر ئەو شارەدا کردووە."

وەکوو لە خەیاڵیدا لە قسەیەک بگەڕێت تا بە خۆی بڵێت، پاشان بە دەنگی بەرز وەکوو لە خۆی توورە بێت: "ئەو شـارە پڕی بووە لە چەقەڵی خوێنخۆر، بیری لێ بکەرەوە بزانە چ جادوویەکت لەو خەڵکە قوڕبەسەرە کردووە!"

لەپێ دەسـتی نابووە ئەملا و ئەولای ئاوێنەکە و لووتی پێوە نووسـاندبوو، چاوی لە چاوی خۆی بڕیبوو، وەکوو بیەوێت لەناو چـاوی خۆیـدا نهێنییـەک ببینێـت. پێڵووی چـاوی دەلـەرزین،

ماســوولکەکانی دەوری چاوی گرژ کردبوون، چەند هەناســەیەک بەو جۆرە لە خۆی ڕوانی، پاشان بە لەپی دەستی توند کێشای بە ڕووی ئاوێنەکەدا: "خەمی من، ترسە لەدەنگی گوللەکان!"

ئاوڕی دایەوە و لەسەر سێپا پلاستیکییەکە دانیشت و سەری بەسەر کۆشیدا شۆڕ کردبووەوە، پاشان ڕاپەڕی و ئەژنۆی بڵاو کردەوە و لە ناوگەڵی شــەرواڵەکەی ڕوانی، کە نێوان ڕانەکانی خوێنی پێوە بوو. پاش زیاتر لە دوو کاتژمێر؛ گەڕایەوە بۆ ســەر پلیکانەکان و جامانە و کڵاوەکەی هەڵگرتەوە، کڵاوەکەی کردە ســەری و جامانەکەی لە ملیەوە ئاڵاند. کاتێک تفەنگەکەی هەڵگرت، لەســەر قادرمەکان و لە جێگاکەی خۆی دانیشــتەوە و تفەنگەکەی لەسەر ڕانی دانا و لێی ڕوانی، پاشان جێگای فیشەکەکەی بینی کە بەر دەرگای ئاســنی باڵەخانەکە کەوتبوو، دیار بوو چەقەڵەکان لە ترسی تەقەی تفەنگەکەی شێخ بایز هەڵاتبوون.

## ٢٠

سەرتاپا ڕەشی پۆشیبوو، سەرپۆشە ڕەشەکەی لە دەموچاویەوە پێچابوو، خۆی چەماندبووەوە و دەستی لە بەر ورگیدا لێک هەڵپێکابوون، سەری شۆڕ کردبووەوە و لە بەر پێی خۆی ڕوانی. ڕەشەباکە بەردەوام تۆزی ئەو بیابانەی لەگەڵ خۆیدا پێچ دەدا. دەمێک بوو ئەو تووڵەڕێگایەی ون کردبوو کە سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە گرتبوویە بەر، تەنها دەیتوانی مەترێک پێش خۆی ببینێت و سێ مەترێک دوای خۆی شوێنەواری پێکانی هەڵبگرێتەوە. بەردەوام لە خەیاڵی ئەوەدا بوو بەڵکوو بەختی هەبێت و ڕێگای بکەوێتە ئاوەدانییەک، گوندێک، یان ماڵێک، وەکوو پێشتر بیستبووی، یان دەواری خێڵێک. لە دەرچوونیەوە لە خۆئامادەکردندا بوو. ئەگەر لەو بیابانەدا ڕێکەوتی کەسێک بکات، چیی پێ بڵێت؟ ئاخۆ ئەو چی گەیاندوویەتیە ئەو جێگایە؟ ئەی بە چ

زمانێک قسەیان لەگەڵدا بکات؟ یان باشترە خۆی بکات بە کەڕ و لاڵ و بە ئاماژەدان داوای یارمەتی بکات. ئەوەی لەو کاتەدا لە خەیاڵەکانی دایدەبڕی؛ تینوویێتی بوو، بە جۆرێک زۆری بۆ هێنابوو لێوی لەژێر سەرپۆشەکەیەوە وشک بووبوونەوە و پێکدا نووسابوون، زمانی لەناو دەمیدا بۆ نەدەجوولا، زوو زوو هەوڵی دەدا لەناو دەمیەوە لیکەڕژێنەکانی بگوشێت و چەند دڵۆپ تەڕی قووت بدات. لە ڕێگا تاکێک لە نەعلەکانی چەقیبوونە لمەکە و لێی بەجێ مابوو، گەرمیی دەنکە زیخەکان پێستی قاچی سوور هەڵگەڕاندبوو، سەر پێکانی ئاوسابوون. تەزوویەک بە گیانیدا دەهات، کاتێک لەگەڵ دەنگی ڕەشەباکەدا وەڕینی سەگەکانی بەرگوێ دەکەوت.

نینۆکەکانی لە دۆشەکی تەختی خەوەکەی گیر کردبوو، هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو، نووزەنووزێکی لێوە دەهات، پاشان خۆی خستە سەر لا و دەستی بە سنگیەوە گرت و دەستەکەی تریشی خستە نێوان ڕانەکانی، بەو جۆرە بە ڕاست و چەپیدا تلی دەخوارد. کاتێک لەسەر تەختی خەوەکەی کەوتە خوارەوە، زریکاندی و هێواش چاوی هەڵبڕی، سەری خست بە لادا و لەناو ژوورەکەی ڕوانی، پاشان هەردوو دەستی بە دەموچاویەوە گرت. کاتێک ڕاست بووەوە و چوارمشقی دانیشت، چوار هێڵی سووری خوێن کە شوێنەواری خوێنی پەنجەکانی بوون؛ بە دەموچاویەوە بەجێ مان، خوێنی ناوگەڵی بوو بە دەستیەوە. کاتێک هەڵسایە سەر پێ، بە دەستێکی؛ شانی ڕاستی دەشێلا، ئەو جێگایەی لە

کەوتنەخوارەوەیدا بەر زەویی ژوورەکە کەوتبوو، لەژێر لێوەوە:
"ئەوەش بەشی من!"

ڕۆژی پێشوو دوای بینینی چەقەڵەکان و بیستنی دەنگی ئەو گوللەیەی لە لوولەی تفەنگەکەی شێخ بایزەوە دەرچووبوو، خەیاڵی ئەویان شێواندبوو، بەردەوام دەنگی تفەنگەکە و شاتەشاتی چەقەڵەکان لە گوێیدا بوون. لە گەرماوەکە دەموچاوی شۆرد و لە ئاوێنەکەدا لە خۆی ڕوانی، جلەکانی بایزی هێشتا لەبەردا بوو، پشتێن و جامانە و کڵاوەکەی لەسەر تەختی خەوەکەی بوون، تفەنگەکەی لەتەنیشتی دەرگای ژوورەکەوە هەڵپەساردبوو، قەراغی چۆغەکەی گرت و بۆنی پێوە کرد: "بایز، قەت گەردنت ئازاد ناکەم!"

جلەکانی بایزی داکەند و بەڕووتی لەبەر ئاوێنەکەدا ڕاوەستابوو، وەکوو هەست بە ماسوولکەکانی دەموچاوی نەکات، بە لەپی دەستی خەریکی شێلانی سەر ڕوومەتی بوو. پاشان دەستی لەبەر لووتیدا ڕاگرت و هاڵاوی دەم و لووتی بە ڕووی بەری دەستیدا کرد: "هەناسەم بۆگەنی گوی سەگی لێ دێت!"

گۆی مەمکەکانی نابوو بە ڕووی ئاوێنەکەوە و دەموچاوی لێ نزیک کردبووەوە. کاتێک دوور کەوتەوە، شوێنەواری چەوریی سەر لووتی و پێستی سەر گۆی مەمکەکانی بەسەر ئاوێنەکەوە دیار بوو: "یا خوا دایکە خێر لە خۆت نەبینیت، بۆ پەنگێک پێت دام!"

لەسەر سێپاکە دانیشت، دوای ئەوەی ئاوەکەی شلەتێن کرد، بێ چاوترووکان لە ئاوێنەکەی دەڕوانی و زوو زوو جامێک ئاوی بەسەر ڕانیدا دەکرد، ماسوولکەکانی دەموچاوی گرژ کردبوون، بێدەنگ دڵۆپە فرمێسکەکانی بەسەر ڕوومەتیدا جۆگەلەیان بەست

و لەژێر چەناگەیدا دەتکانە سەر ڕانی و تێکڵاوی ئاوەکە دەبوون: "لەم مەینەتییە ڕزگارم نابێت!"

مەستوورە گەڕابووەوە بۆ ژووری نووستنەکەی و خاولییەکی دابوو بەسەر شانیدا و بەڕووتی لەبەر کەنتۆرەکەیدا وەستابوو، وەکوو شتێکی بیر کەوتبێتەوە چووە سەر تەپڵەکێک و لەسەر دۆلابی جلەکانی دەستی دەگێڕا. بەرزیی تەپڵەکەکە و درێژیی باڵای ئەو، هێشتا لە ئاستی باڵای کەنتۆرەکەدا نەبوون. بێ ئەوەی چاوی لێی بێت، بە گسکێک چی لەسەر کەنتۆرەکە بوو؛ ماڵییە خوارەوە. دەنگی زرەی شکانی شووشە هات، ناو ژوورەکەی پڕ بووبوو لە تۆز، خێرا خاولییەکەی لە دەم و لووتیەوە ئاڵاند، لەسەر تەپڵەکەکە دابەزی و دوای ئەوەی پەنجەرەکەی کردەوە؛ بۆ مەتبەخەکە چوو، وەستا تاوەکوو تۆزی ژوورەکەی لەسەر زەوی و تەختی خەوەکەی نیشت.

بینیی لەسەر کەنتۆرەکەیەوە وێنەیەکی لەچوارچێوەگیراوی خستبووە خوارەوە، وێنەکە تەنها شووشەکەی شکابوو. دوای ئەوەی شووشە شکاوەکەی کۆ کردەوە، وێنەکەی لەسەر تەختی خەوەکەی دانا و چوارچێوە و شووشە شکاوەکەی لە پەنجەرەکەوە فڕێ دایە باڵکۆنی باڵەخانە. گسکی ژوورەکەی دا و لە پەنجەرەکەوە بەتانییەکانی تەکاند. بەردەوام چاوی لەسەر وێنەکەی بایز بوو، کاتێک لێی ڕوانی؛ لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەوە بارامی کوڕت دایگرتیت، لێی کردیتەوە و فڕێی دایتە سەر ئەو دۆلابە. بارام ویستی بتخاتە تەنەکەی خۆڵەکەوە، من دەستیم گرت!"

دەنگی هەڵبڕیبوو، پاشـــان چوو لەتەنیشـــتی وێنەکەی بایزەوە دانیشـــت و بەردەوام بوو و گوتی: "بایز، دوای ئەو ڕۆژەی تۆ ماوەیەک بێسەروشوێن بوویت، بارام بۆ دواجار سەردانی ئێرەی کرد، ئیتر مەپرســە چەند داخلەدڵ بوو. لە ڕاسـتیدا ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی بێت بۆ ئێرە، بۆ لای دایکی چووبوو، مەبەستم لای ڕەعنای ژنتە. ئەو کوڕە قوڕبەسەرە دوای ئەوە باسی ئەرخەوانی خوشکی بۆ کردم، کە چۆن ژیانێکی کولەمەرگی بەسەر دەبات. بارام دەیوت ئەرخەوان تاوەکوو بێت باری دەروونیی خراپتر دەبێ، چونکە لە ڕۆژی ڕووداوەکــەوە لــەپێ کــەوتووە و ئیفلیج بووە، چونکــە گوللەکان بەر ئێسقانەکانی سمتی کەوتبوون، ئیتر ئەو قوڕبەسەرە قاچی ئیفلیج بووە. دەڵێن پێدەچێت حامیدی برات ئەو کارەی کردبێت، بارام وتی مامە حامید تەقەی لە ئەرخەوان کردووە! ئەو برا گیانیبەگیانییەی تۆ کە ڕاتسـپاردووە پاسـەوانی لە شـەرەفت بکات، ئەو کچە گەنجەی لە پەلوپۆ خســـتووە. ئاخر پێم ناڵێیت لەسەر چی! توو خوا بایز پێم ناڵێی لەسەر چی ئەو زوڵمەتان لەو کچە کردووە! بارام دەیوت باوکم و مامە حامیدم زوڵمیان لە من و ئەرخەوان کرد. بە قســـەی بارامی کوڕت بێت، حامیدی برات چاوی لەســـەر ڕەعنای ژنتە، لەوانەیە ئەمەیان تەواو دڵت ئازار بدات، چونکە جاران هەمیشـە لێم دەبیسـتیت و دەتوت، من پیاوم پیاو، بێشەرەفی لە خواش قبووڵ ناکەم!"

بێدەنگ لە چاوی بایزی ڕوانی، دەسـتێکی لەسـەر دەموچاوی وێنەکەی دانابوو، لەنێوان پەنجەکانیەوە چاوی لێوە دیار بوو، توند چنگی کرد بە دەموچاویدا و لەناو دەسـتیدا چرچی کرد و گرتی،

چاوی نووقاند و تۆنی دەنگی هێواش کردەوە و لەژێر لێوەوە و وەکوو بیەوێت لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "ئەو ڕۆژە بارام کاتێک ئەم وێنەیەی تۆی داگرت، پێی گوتم گوایا هاوشــێوەی ئەم وێنەیەت لەلای ڕەعناش هەڵواســراوە، ویســتبووی لەوێش داتگرێت و لەم دووماڵەدا کۆتایی بە دەســەڵاتی تۆ بێنێت. لێرە من بەگوێم کرد، بەڵام لەلای ڕەعنا تۆ هێشــتا پیاوە قارەمانەکەی جارانیت، هەر چەندە ڕەعنا لەجیاتیی تۆ؛ حامیدی برات ســـواری خۆی دەکات، بەڵام لەوە دەچێت خەیاڵی هەر لەلای تۆ مابێت."

مەســتوورە بەڕووتی بەپێوە وەســتابوو، دوای ئەوەی قژی وشک کردەوە، خاولییەکەی لە بنباڵەکانیەوە لەسەر مەمکەکانیەوە ئاڵاند و گوتی: "ئینجا وا بزانم... ڕەعنا ئێســتاش خەیاڵی لای تۆیە، نەک لەبەر ئەوەی خۆشــی دەوێیت، لەوانەیە ڕەعنای ژنت وەکوو بارام و ئەرخەوان تەنها بیەوێت تۆڵەت لێ بکاتەوە. با ئەوەشــم لەبیر نەچێت، بارام کچێکی لەگەڵدا بوو ناوی حەنان حەســۆ بوو، کچی حەســۆی شــەریف زێباری بوو، ئاوای پێ گوتم کە تۆ و باوکی یەکتری دەناســن و کاتی خۆی پێکەوە کۆنەجاش بوون، وەکوو بارام ئەو ڕۆژە بەدەم پێکەنینەوە دەیوت: 'من و حەنان خزمی یەکین، چونکە کاتی خۆی باوکمان پێکەوە بەعسی بوون و دەســتیان لە خوێنێکدا تێکەڵ بووە!' کاتێک بارام ئەمەی گوت، حەنان لەگەڵیدا پێدەکەنی، دیار بوو منداڵەکانی تۆ و حەســۆی شــەریف زێباری هاوڕێت شــەرم لە کردەوەکانی باوکیان دەکەن، باشتر کە گەلێک جار گیا لەسەر بنجی خۆی ناڕوێتەوە. ئەو ڕۆژە بێ ئەوەی بارام و حەنان هیچم بۆ باس بکەن، خۆم ئەوەم لەلا

ئاشـــکرا بوو کە ئەوان دڵخوازی یەکترین، کچێکی زۆر جوان و شۆخوشەنگ، قژکاڵ و چاو ڕەش، دێنەوە لە هەولێر دەژین، وتیان ئیتر ئێمە هەقمان بەسەر باوکمانەوە نییە و بۆخۆمان ژیانێکی نوێ دەســـــت پێ دەکەین، هەوڵی ئەوەیان داوە کە ناوەکانیان بگۆڕن، لەبەر ئەوەی کەس لەمەولا بە هۆی بێڕەوشـــــتی و تاوانەکانی باوکیانەوە گێچەڵیان پێ نەکات.

## ٢١

تاوەکو ڕۆژی دوایی وێنەکەی شـــێخ بایز هێشـــتا لەســـەر جێگاکەی بوو، مەســـتوورە بەســـەر وێنەکەی شـــێخ بایزەوە وەســـتابوو، بە دەســـتێکی چرچی دەموچاوی شـــێخ بایزی ڕێک کردەوە. پەرداخێک چای تێ کردبوو، زوو زوو قومی لێ دەدا: 'دەزانیت بارام ڕۆژێکیان بەمیوانی بۆ لای دایکی چووبوو، وا بزانم خەتاکە لای منەوە بوو، چونکە بووم بە قســـەی خۆمەوە و پرسیارم لێ کرد ڕەعنای دایکی چۆنە؟ پاشان بارام قسەوباسی چوونەکەی بۆ لای دایکی ئاوا بۆ گێڕامەوە:

'هەموو جارێک کە بچم بۆ ئەوێ، پێش ئەوەی بگەمە بەردەم دەرگای ماڵەوە و لە دەرگاکە بدەم، دایکم دەرگای حەوشـــە و ناو داڵانەکەی خســـتووەتە ســـەرپشـــت و خۆی لە هەیوانەکەدا ڕاوەستاوە. هەر جارێک سەردانی بکەم، بەو جۆرەیە. پێش ئەوەی

بگەمە لای، لە دوورەوە پێم دەڵێت: 'دڵم لێیدابوو، خۆم زانیم کە دێیت!' جاران لە خەیاڵی خۆمدا دەموت نەخێر دایکە، هەموو جارێک ئەو دەرگا کردنەوەت بە ڕێکەوت بووە، بەڵام ئەوەندە دووبارە بووەوە، ئەوەتا ئێستا باوەڕم بەوە هێناوە کە دایکم دڵی خەبەری پێ داوە و زانیویەتی من دێم بۆ لای و لە دیواری حەوشـــەی ماڵە کۆنەکەمان نزیک بوومەتەوە. بەردەوام ئەو پرســـیارەی لێ دەکەم، چۆنت دەزانی؟ ئەویش وەکوو جارانی پێشـــوو دەڵێت: 'دڵم خەبەری پێ دابووم کە بارام دێت.' ئەوەتا ئێستاش وەکوو هەموو جارەکانی تر گەیشتبوومە سەر سەکۆی بەردەمی ئەو ماڵە و هەڵوێســـتەم کردووە و لەو جێگایە دەڕوانم، لەبەر خۆمەوە وەکوو لەگەڵ یەکێکدا بدوێم: 'ئا لێرەدا، لەم بەرهەیوانەدا بورهانی برام کوژرا!"

مەســـتوورە دەموچاوی لە ڕووی وێنەکەی بایز نزیک کردبوویەوە و لەژێر لێوەوە گوتی: "هەی زاڵم، تۆ باسی کوژرانی ئەو کورەتت بۆ نەکردم، بەڵام نێوان خۆمان بێت هەســـتم پێ کردبوویت، دەمزانی کە جەرگت ســـووتاوە، بەڵام تۆ هەر لە منت شاردەوە."

پاشان خۆی ڕاست کردەوە و تۆنی دەنگی گۆڕی و گوتی: "ئێ با بێمەوە سەر قسەکانی بارام:

'کە دێمە بەر ئەو ماڵە دەوەستم دیمەنەکانی ئەو ڕۆژ و شەوەم دێنەوە پێش چاو. پێش ڕووداوەکە و دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە لەگەڵ بورهانی برام پێکەوە لە بازاڕ بووین، چووین لای ساڵحی خەیات جلە کوردییەکانمان هێنایەوە. دوای ئەوەی نانی ئێوارەمان

خوارد، جارێکی تر باوکم داوای لێ کردین تا جلە تازەکانمان تاقی بکەینەوە. ڕانک و چۆغەکانمان لەبەر کردبوو و خەریکی بەستنی پشتێنەکانمان بووین، لەو کاتەدا لەبەردەمی ماڵەکەماندا بوو بە دەستڕێژ و تەقەکردن. هەموو شڵەژاین، پێش هەموومان باوکم لە ژووری میوانەکە ڕایکرد، من لە جێگای خۆم ڕاکشام و لەتەنیشت دایکم و ئەرخەوانی خوشکمەوە پاڵ کەوتم. تەقەکان زۆر نزیک بوون، چەند گوللەیەک بەر شووشەی پەنجەرەکان کەوتن، شووشەکان هاڕەیان کرد و بەر بوونەوە. بەردەوام گوللە بەر دیواری دیوی دەرەوە و ناوەوەی ماڵەکە دەکەوت، لەو کاتەدا دایکم؛ من و ئەرخەوانی بەسکەخشکێ بەدوای خۆیدا بۆ ناو داڵانی ماڵەکە ڕاکێشا، لەناکاو لە دوامانەوە دەنگێکی زۆر بەرز هات، وەکوو چۆن بڵێیت قومبەلەیەک لەناو ژوورەکەدا تەقیبێتەوە. دەستێکم بە گوێیەکمەوە گرت و گوێکەی ترم لە ڕووی ئەرزەکە توند کرد. لەو کاتەدا نەمتوانی دەستم لە دەستی دایکم دەربێنم. لەدوای ئەوەوە گوێم لە هیچ نەما، تەنها لە گوێمدا زرنگانەوەیەکی بەردەوام دەهات، ئەویش وەکوو زرنگانەوەی مەنجەڵێکی مس وا بوو. هەروەها لەناو تەپوتۆزدا ون بووین و چاوم لە هیچ نەما. ئاگام لێ بوو مامەکانم چەند جارێک بەسەر ئێمەدا هەنگاویان نا و جارێک بۆ نهۆمی سەرەوە ڕاياندەکرد، زوو زوو لە دەرگای پشتەوە دەچوونە حەوشەی پشتەوەی ماڵەکەمان. بەو جۆرە زیاتر لە کاتژمێرێک تەقە و تەقینەوە بەردەوام بوو. پاشان بە ئەستەم گوێم لێیان بوو دایکم و ئەرخەوان دەگریان، دایکم بەدەم گریانەوە دەیوت: 'دەی خوایە ڕەحممان پێ بکەیت!' دوای ئەوەی تەقەکان

کۆتاییان پێ هات، هەڵســـاینەوە و لەناو تەپوتۆزەکەدا خۆمان تەکاند، هێشـــتا ماڵەکە پڕ بوو لە دووکەڵ و تۆز. لەو کاتەدا کارەبای ماڵەکەمان بڕابوو، بەو تاریکییە دایکم بە ماڵەکەدا دەستی کرد بـە گـەڕان، بێجگـە لـە نـاوی بـاوکم؛ یـەک یـەک بـانگی هەمووانی کرد، چونکە دایکم دەیزانی لە ڕووداوێکی ئاوادا باوکم لـە کوێ خۆی دەشـــاردەوە، دەچووە ژێرزەمینـەکـە و دەرگـا ئاسنەکەی لەسەر خۆی دادەخست، ئەو ژێرزەمینەی بەتایبەتی بۆ ڕووداوێکی لەو جۆرە دروســـت کرابوو، براکانی دەبوایە لە ســـەرەوە بوونایە و پارێزگارییان لە باوکم و ماڵەکەی بکردایە. هەروەها لەو ســاڵانەی دواییدا بورهانی براشــم وازی لە قوتابخانە هێنا و بوو بە پاســەوانی باوکم، چوار بۆ شــەش پاســەوانیش لە چواردەوری ماڵەکەمان بوون. بەبیرم دێت لەو کاتەدا دایکم بەدەم گریان و هەنسکهەڵکێشـانەوە وتی: 'دەی کوا بورهان، لەکوێیە ئەو کوڕە؟ بۆ دەنگی نییە؟' کاتێک لەگەڵ ئەرخەوانی خوشـــکم هاتینە دەرەوە، لەو کاتەدا بەرهەیوانی ماڵەکە لە ژوورەوە ڕووناکتر بوو، من پێش ئەرخەوان بینیم، تاکوو ئەو کاتەی گەیشـــتمە لای، وام دەزانی لە ترســـی تەقەکان لەپاڵ دیواری حەوشـــەکەدا خۆی مات کردووە. چووم لە تەنیشـــتیەوە دانیشـــتم، تفەنگەکەی هێشـــتا لە باوەشـــیدا بوو، دوو مەخزەنی بەتاڵ لەنێوان ڕانەکانیدا. چەند جارێک لەبەر خۆمەوە بانگم لێ کرد: 'کاکە بورهان! کاکە!' دوای ئەوەی هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، دەستم برد و دەستی ساردوسڕی بەر دەستم کەوت، پاشان چەند جارێک ڕاموەشاند. بەڵام دیار بوو پێش ئـەوەی من بگـەمـە لای، ئـەو گیـانی دەرچووبوو، تـەنهـا

گوللەیەکێ لە ڕوومەتی دابوو. لەو کاتەدا مامە حامیدم بەدەم هاوار و بانگەوە گەیشـــتە ســـەرمان: 'کوڕە، حەکیم و حیکمەتیش پێوە بوون.' ئەوە زیاتر لە چەند ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕ دەبێ، من هێشـــتا نەمتوانیوە کوژرانی بورهان و ئەو دوو مامەم لەیاد بکەم، یان هیچ نەبێت تۆزێک ڕەنگیان کاڵ ببێتەوە و ئەوەندە بۆ ســـەر ڕۆحم گوشـــار نەهێنن. بەبیرم دێت تەرمی ئەو ســـێ کوڕە گەنجەیان بە ئۆتۆمبێل برد، دوای دوو کاتژمێر کاتێک مامە حامید لە نەخۆشـــخانە گەڕایەوە و هەواڵی مردنی بورهان و مامەکانمی بۆ هێنایەوە، ئەوکات باوکم لە ژێرزەمینەکە هاتە دەرەوە، خۆی لە مامە حامید و پاسەوانەکانی تووڕە کرد و خۆیان نەشاردایەتەوە، دەیکوشتن."

مەستوورە بەدەم قسەکردنەوە قومی لە چاییەکەی دەستی دەدا، زیاتر چرچی ســەر دەموچاوی ڕێک کردەوە و لە ناوچاوی بایزی ڕوانی و گوتی: "بایز، کاتێک بارام ئەمەی بۆ دەگێڕامەوە، دەگریا و وەکوو ئەو ڕووداوانە ئەو ڕۆژە ڕوویان دابێت. هەی ترســـنۆکی خۆپەرســـــت، خۆت لە دوژمنەکانت شـــاردووەتەوە و ئەوانت بەکوشت داوە!"

دوای ئەوەی ئەمەی لەبەر خۆیەوە گوت، بۆ مەتبەخەکە بەڕێوە بوو، دەستی بەسـەر سنگیدا دەهێنا و زوو زوو هەناسـەی قووڵی هەڵدەکێشا. دوای ئەوەی کوپەکەی لەسەر کەوانتەرەکە دانا، لەبەر بەلوعەکەدا دوو قوم ئاوی خواردەوە، گەڕایەوە و پێش ئەوەی بگاتە ناو ژوورەکە لەدوورەوە لە وێنەکەی بایزی ڕووانی و گوتی: "دوای ئەوە بارام بەردەوام بوو لە قسەکانی و پێیوتم:

'باوکم دەمانچەیەکی لەناو دەسـت بوو، بەردەوام بە ماڵەکەدا دەگەڕا و لەبەر خۆیەوە دەیوت: 'تۆڵەیان لێ دەکەمەوە، نایەڵم بەسـەریانەوە بچێ، ئەو خوێڕییانە، خوێنیان دەڕێژم. مەگەر من کوڕی باوکی خۆم نەبم!' باوکم بە درێژایی ئەو شەوە بە ماڵەکەدا گەڕا و لەبەر خۆیەوە جنێوی دا. ئەو شـەوە ماڵەکەمان پڕ بوو لە چەکدار، هەموو هاوڕێ و گەلێک لە خزمەکانمان هاتبوون، هەریەکە و بە جۆرێک تەگبیری بۆ باوکم دەکرد کە چۆن بتوانن تۆڵەی بورهان و مامەکانم بکەنەوە. ئەوەندەم نەزانی دایکم لە بەردەممدا پەیدا بوو: 'بارام! ڕۆڵە بارام، ئەوە بۆ دیسـان داڵغە بردوویتی؟' وەکو نەزانێت من بیر لە چی دەکەمەوە، هەموو جارێک پێی دەڵێم، بەڵام دەزانم بەئەنقەسـت لەبیر خۆی دەباتەوە. هەرچ کاتێک دەچم و لەوێدا دەوەسـتم، ئەوەم پێ دەڵێت و لە خەیاڵەکانم دامدەبڕێت. دایکم ڕەفتاری تووتی دەنوێنێت، چونکە ئەو لێدوانەمان بەردەوام دووبارە دەبێتەوە: 'چا حازرە! نانت بۆ بێنم؟ دەڵێم ڕۆڵە گیان، برنجم لێنابوو!'

'تێرم، نانم خواردووە.'

'دەی دایکت بمرێت، بێ ژن و کەسـوکار و لەو غەریبییە دەبێ چی بخۆیت! یان هەموو ڕۆژێک بۆ چێشتخانە دەچیت؟'

'هەموو ڕۆژێک، ڕۆژی دوو جار!'

'بەڕاستتە! لە ماڵەوە چێشت لێنانێیت؟'

'چێشتلێنانی چی، کوا من تاقەتی ئەوەم هەیە، هەر کاتیشم نییە!'

'دەی قوڕ بەسـەر ئەو باوکەت! جا توو خوا ڕۆڵە، ئەوە ژیانە تۆی تیایت!'

'بە ناشکوری نەبێت، لە سایەی سەری باوکمدا پێی ڕازیم!'

'کوڕە حەدت نەبێت، لەبریی ئەوەی ڕەحمەتی بۆ بنێریت. بە خوا بە خوا پیاوێک بوو، لەم شـــارەدا وێنەی نەبوو. ڕۆڵە گیان، بزانە جارێک هەواڵت پرسی و بزانیت لەکوێیە؟!'

'ئەوە خەمی من نییە، بۆ دۆعای بەخێریش... جا تۆ بڵێی دۆعای من فریای بکەوێت!'

'خوا بەڕەحمە. ئەی شێخ بایزی قوڕبەسەر، وەجاخت ڕوون!'

'چاییت بۆ لێنابووم؟ وا بزانم سارد بووەوە!'

'دەی قوڕ بەسەر خۆم، بۆ خۆم و ئەولادم!'

'با باسی شتێکی تر بکەین و ئەوەندە دڵی خۆت تەنگ مەکە!'

'بە مانگ خۆم بەتەنیا لەم ماڵەدا دێم و دەچم، بە خوا هەر شێتیش بووم!'

'خەتای خۆتە، چەند جار داوام لێ کردیت لەگەڵم وەرە، لە بەغداد شـــوقەکەم گەورەیە و جێگای هەردووکمان دەبێتەوە، با دەستمان لەم خانووە کاولبووەش بێتەوە.'

'کوڕە من چی بکەم لەو غەریبییە، ئێوە زمانەکە دەزانن، من چی! چەند ســـاڵم بەناچاری لە غەریبی بەســـەر برد، مەگەر بەمردوویی لەم خانووە بچمە دەرەوە. من وەکوو ئێوە سـپڵە نیم، ئەم ماڵە بۆنی بایزی ڕەحمەتیی لێ دێت. بە خوا ئێســـتاش وا دەزانم ئا لەویا، لەسەرلا شانی لەسەر ئەو سەرینە پەڕە داداوە.'

'ئەوە کێشەکەیە، سێبەری ئەو پیاوە بەسەر هەردووکمانەوەیە لە هەرچ جێگایەک بین!'

'یا خوا خوا عەفووی بکا. دەی ڕۆڵە، ئەو پیاوە چل ساڵی ڕەبەق مێردم بووە، ئەرەوەڵڵا دەبێ لە سێبەری ماڵەکەیدا بمرم.'

'دەی خوا بۆ یەکتان بێڵێت. کوا، با پێکەوە چایەک بخۆینەوە.'

'دەی خوا ئەوانە بگرێت کە بە ناحەق ئەویان لە من ونکرد!'

'کوڕە دایکە، باوکم سەری خۆی هەڵگرتووە!'

'وەڵڵا ناحەزەکانی دەرمانخواردیان کرد.'

'ئەو لە خەجاڵەتیدا لەوانەیە لە کەلاوەیەکدا مردبێت!'

'خوا حەقی ئێمە بسەنێ.'

کاتێک دایکم ئەمەی لەبەر خۆیەوە وت و بۆ مەتبەخەکە گەڕایەوە، من لەو کاتەدا لەو سەرینە پەڕەم ڕوانی کە لە سووچێکی قەنەفەی ژووری دانیشتنەکە دانرابوو، دیار بوو دایکم تازە بەرگی تێ گرتبوو، ئەوسا بەرگەکەی قوماشێکی سەوز و گوڵی زەردی لەسەر بوو. کاتێک سەرم هەڵبڕی، سەرنجم چووە سەر وێنەکەی باوکم، هەمان شێوەی ئەم وێنەی لای تۆش هەڵواسراوە، من ڕاهاتووم تەنها لە چاوی بڕوانم، کاتی خۆی داوای لێ دەکردم کاتێک قسەی لەگەڵ دەکەم، دەبێ لە چاوی بڕوانم، ئەو بە سەعات قسەی دەکرد و من دەبووایە بێ چاوترووکان لێم بڕوانیایە. گوێم لە خشەی پێی دایکم بوو لە مەتبەخەکە دەهات و دەچوو، هەمان هەستی ئەوسام هەبوو، قاچم دەلەرزین و هەستم بە ئارەقەیەکی سارد کرد کە لە بنباڵەکانمەوە دڵۆپ دڵۆپ هاتنە خوار. نازانم چەند دەبوو لەوێدا وەستابووم. کاتێک دایکم دەستی خستە سەر شانم، هێشتا وشک لە جێگای خۆم وەستابووم و بێدەنگ داواکەی باوکم جێبەجێ دەکرد،

ئەویش تا ئەو دەیەوێت و قسـەی مابێت، من بەپێوە بوەسـتم و لە چاوی بڕوانم. 'دەی یادت بەخێر و خۆزگەم بەو سەردەمە، بە خوا لە سایەی سەری ئەودا لە هیچمان کەم نەبوو!' دوای ئەوەی دایکم ئەمەی گوت، دەستی لە شانم داگرت. ئاگام لای دایکم نەما، هەستم دەکرد باوکم گرتبوومی، بەردەوام ڕەش و سـپی کۆمەڵێک دیمەن دەهاتنە پێش چاوم، باشـترە بڵێم کۆمەڵێک دیمەنم لەناو چاوی باوکمدا دەبینی، یان لە شـووشـەی سـەر وێنەکەدا دیار بوون، نازانم، لەوانەشـە تەنها لە خەیاڵی خۆمدا بووبن! دەمویست چاوم لەسـەر یەکێک لەو دیمەنانە ڕابگرم، بەڵام دەنگی باوکم لەرزەیەکیان بە دیمەنەکان دەکرد و تێکەڵ دەبوون بەسەر یەکتردا، بێجگە لەوەی بەردەوام بۆنی سـابوونی ڕیشـتاشـینەکەیم دەکرد. نازانم دایکم چەند جار هاتە لامەوە وەسـتا و چیی وت و چۆن ڕۆیشـت، تا ئەو کاتەی دەسـتی ڕاسـتم هەڵبڕی و بەرەو ڕووی باوکم وەکوو جاران ڕامگرت، چۆن ئەوسـا بەردەوام مۆجگاریی دەکردم، مەچەکمی توند لەناو دەسـتی دەگرت و زۆر بەهێز دەیگوشـی، بە درێژایی لێدوانەکانمان ئەو دەستی لە مەچەکم بەر نەدەدا و تاوەکوو دەهات قایمتری دەکرد، کاتێک ئەو لە قسـەکانی دەبووەوە، من سـەری پەنجەکانم شـین هەڵدەگەڕان. جاران کە منداڵ بووم، دوای ئەوەی ئەوە ڕووی دەدا، لە خەیاڵی خۆمدا دەموت باوکم بەهێزترین پیاوی دونیایە، ئەوەتا ئێسـتاش ئەوە دووبارە دەکەمەوە: 'باوکم بەهێزترین پیاوی دونیایە'، وەکوو چۆن دایکم ئێسـتاش وا دەڵێت. هەسـت دەکەم هەتاوەکوو ئەویش لەم ماڵەدا بێت و لەو وێنەیە بڕوانێ، باوەڕی وایە کە باوکم بەهێزترین

پیاوی دونیایە. دەبێ لەو کاتەدا دەنگم هەڵبڕیبێت، دایکم لە شانمەوە بۆی سەندمەوە و وتی: 'ئەرێوەڵلا، لەم شاری هەولێرەدا بایز پیاو نەبوو شان بدات لە شانی!' منیش لەبەر خۆمەوە وتم دەزانم، منیش ئەو باوەڕم پێی بوو. باوەڕم پێ بکە مەستوورە خان، هێزم دەدایە بەر خۆم تا ڕووم لە وێنەکەی باوکم وەربگێڕم نەمتوانی، تاوەکوو ئەو کاتەی دایکم شانی گرتم و بەلای خۆیدا وەریگێڕام و پێی گوتم: 'ئەرێ ڕۆڵە بۆ وا وشک بوویت، ئەوە قەیرێکە ئەو چایەم تێ کردووە، وا بزانم ساردیش بووەتەوە. ئا قومێکی لێ بدە!' کاتێک لە دایکمم ڕوانی، بە فەقیانەی کراسەکەی خەریکی وشککردنەوەی چاوی بوو، پشتی تێ کردم و چوو وەکوو خوویەکی هەمیشەیی لەسەر زەوی ژوورەکە لەتەنیشت سەماوەر و قوری و پیاڵەکەیەوە دانیشت. لەلایەوە دانیشتم و ئەویش پیاڵە چایەکەی بۆ ڕاگرتم. کە پیاڵە چایەکەم لێ وەرگرت، لێم ڕوانی و پێم وت تۆش دڵت تەنگە؟ 'لەو ڕۆژەوەی هەواڵی بێسەروشوێنکردنی بایزم بیستووە، ئیتر شەوێک نەبووە بە ئیسراحەت نووستبم!' دایکم ئەمەی گوت و خەیاڵم چوو بۆ ئەو ڕۆژ و شەوانەی باوکم نەخۆش بوو، لە نەخۆشخانەی کۆماری بەتەنیا لە ژوورێکدا کەوتبوو، لەگەڵ دایکم و ئەرخەوانی خوشکمدا بەدیاریەوە بووین، هەتا هەناسەی توند دەبوو و خەوی لێدەکەوت؛ مۆجگاریی دەکردین، بە منی دەوت کە چۆن بتوانم لەگەڵ مامە حامیددا تۆڵەی بورهان و مامەکانم لە دوژمنەکانی بکەینەوە. بە مەزەندەی باوکم، هەر ئەوان باوکیشیان کوشتووە. من و ئەرخەوان چووبووینە ئەملا و ئەولای تەختی خەوەکەی و وەکوو

جاران مەچەکی هەردووکمانی گرتبوو، زۆری لە خۆی دەکرد توند مەچەکمان بگوشێت، ئەوەندە نەخۆش بوو بەئەستەم هەستم بە هێزی دەستی دەکرد. دەستم خستە سەر شانی دایکم و پێم وت:

'تۆش وەکوو من ئەو ڕابردووە لەکۆڵت نابێتەوە؟'

'وەڵڵا من خۆزگەم بەوسا، بەس نەبوو تەنیا نەبووم و بۆخۆم خاوەنی ماڵ و مێردی خۆم بووم!'

'دەی بۆ گەڕایتەوە و لەلای من و ئەرخەوان نەمایتەوە؟'

'کوڕە من چی بکەم لەوێ، خۆ تۆ و ئەرخەوان شەوێک نەبوو بکەونە ماڵەوە، شەوێک نەبوو سەرخۆش نەبن، بە خوا ئەو باوکەت بیزانیایە؛ لێی قبووڵ نەدەکردن و دەیکوشتن!'

'ماڵی باوکم ئاوا نەبێت!'

'کوڕە ڕۆڵە گیان خۆتان هیچتان تیا بەسەر نییە، بە خوا ئەگەر بچوونایەتەوە سەر باوکت و مامەکانت، ڕۆژتان بەو ڕۆژە نەدەگەیشت.'

'وایە دایکە، قسەکەی تۆیە.'

"ئەیچۆن، ئەوە حامید بەگی مامت ئێوارە دێت بۆ ئێرە، بە خوا دەیوت زۆر لێیان تووڕەم.'

'لە کێ تووڕەیە؟'

'لە تۆ و ئەرخەوان.'

'جا ئەو کاری چییە بەسەر ئێمەوە؟'

'چۆن، ئەو لە جێگای باوکتە. ڕۆڵە، ئەوە تۆ پیاویت قەیناکا، بەڵام ئەو کچە هەموو خەڵکی باسی دەکات و بۆ پارە؛ هەر شەوە و یەکێک سواری خۆی دەکات.'

'نازانم، من ئاگام لێی نییە.'

'دەی چۆن برایەکیت، ئەوە شەرەفی تۆیە!'

'مەگەر تەڕەماشی من بێت، پێم وتیت مەگەر بە ڕێکەوت ببینم!'

'ئەوە دوایی لەگەڵ حامید باسی بکەن و تەگبیرێکی لی بکەن.'

'من نامەوێت مامە حامید ببینم.'

'چۆن دڵت دێ وا بڵێیت، بە خوا حامید بەگ پیاوێکە دەبێ تۆ فەخری پێوە بکەی. ڕۆڵە، ئەو وەکوو باوکتە.'

'بۆ شووی پێ ناکەیت؟'

'دەی خوا بتگرێت، ناشـکوری خوا نەبێت ئێمە چی بکەین، من و ئەو هەر یەک شک دەبەین.'

'خوا بۆ یەکتریتان بیڵێت.'

'بە خوا تۆ و ئەرخەوان هەتا خاوەنی ئەو دڵە پیسـەتان بن، لە ژیان ئیسراحەت ناکەن.'

'دەزانم، بەڵام ئێمە ئاواین چی بکەین، ماڵی ئێوە ئاوا بێت.'

"جا دەبێ شـوکری خوامان بۆ بکەن کە ئێوەمان بەو تەمەنە گەیاندووە.'

'سـەد خۆزگەم بە بورهان!' لەدوای ئەوەی ئەمەم بە دایکم وت، هەڵسا و چوو لە مەتبەخەکە خۆی خەریک کرد بە قاپ شۆردنەوە، منیش بە دەرفەتم زانی و لەناو دەرگای مەتبەخەکەوە دەسـتم بۆ هەڵبڕی و پێم وت: 'من دەڕۆم.'

لەو کاتەدا پشتی لە من بوو، دانەویبووەوە و کیسەیەکی سپیی بە دەسـتەوە بوو، ئاوڕی لێ نەدامەوە و لەبەر خۆیەوە پرسـیی: 'ئێوارە دێیتەوە؟'

'نازانم.'

ئەو ڕۆژەی بارام ئەو قسانەی بۆ گێڕامەوە، چەند جارێک لە کاتی گێڕانەوەی قسەکانیدا سەری خستە سەر شانم و گریا. بارام کوڕێکی بالابەرزی لاوازی سەر و ڕیش هاتوو، پێستی زەرد هەڵگەڕاوە، بەردەوام جگەرە دەکێشێت. ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی بڕوات، لەبەرامبەر وێنەکەی تۆدا وەستا و دەستی گرتم و پێی گوتم: 'هاتووم بۆ لای تۆ، تۆش وەکوو دایکم وێنەیەکی ئەو زاڵمەت بەرامبەرم هەڵواسیوە!'

مەستوورە دیسان لە وێنە چرچکراوەکەی ڕوانییەوە و کاتێک لەسەر جێگاکەی هەڵیگێڕایەوە، گوتی: "بایز، منیش کاتێک ئەو قسانەم لە بارام بیست، پێم وت ئێ ڕۆڵە گیان لای بەرە، دایگرە و بیخەرە ئەو کەنتۆرەوە. کاتێک بارام وێنەکەتی داگرت، ویستی بە پێلەقە بچێتە سەر سەرت و وردوخاشت بکات و بتخاتە تەنەکەی خۆڵەکەوە، وتم قەیناکا با دەستی بگرم و لەبەر چاومدا ئەوەندەی تر ناشرین نەبێت."

مەستوورە وێنەکەی بایزی بەجێ هێشتبوو، لەبەر ئاوێنەی گەرماوەکەی بە شانەیەک خەریکی داهێنانی قژی بوو، لە ئاوێنەکەدا لە چاوی خۆی ڕوانی و گوتی: "تۆ بڵێی کتەی داماو چیی لێ بەسەر هاتبێت! بچم سۆراغێکی بکەم باشە."

## ٢٢

چوار ڕۆژ بوو هـــەولێر چۆڵ بووبوو، مـــەســـــتوورە پێش خۆرکەوتن بۆ بەردەم بارەگای یەرمووک چووبوو، ســـەربازەکان میلی تفەنگی لێ دەهێننەوە و دەریدەکەن، پاشـــان بۆ ناو کۆڵان و بەردەم باڵەخانەکانی ئیسـکان گەڕابووەوە، بەســـەر شـۆشـتەکاندا دەگەڕا، جووتێک نەعلی بەسەر پێوە کردبوو، وەکوو ڕۆژەکانی تر زوو زوو دەچووە بەردەم باڵەخانەکان و ســـاتێک ڕادەوەســــتا، وەکوو چاوەڕوانی هاتنەدەرەوەی کەسـێک بکات. دەسـتەسـڕێکی سپیی لەناو دەست بوو، ماکسییە سوورەکەی لەبەر کردبوو، شان و ســـەرسـنگی ڕووت، ماکســـییەکەی تاوەکوو ســـەر ئەژنۆکانی گەیشتبوو، ئەوەندە بە بەری کورت بوو؛ لە عەزی دەچوو، لەسەر سمتی تەسک و بۆ سەر ڕانەکانی چرچ و واڵا. پووزەکانی وەکوو ڕەنگی ماکســـییەکەی ســـوور هەڵگەڕابوون. لەو کاتەدا لەبەر

خۆڵبارین، لەناو باڵەخانەکانی ئیسـکانەوە؛ ماڵەکانی گەڕەکی سـەیداوەت نەدەبینی. تۆزێکی زەرد لەسـەر قژ و سـەر پێستی مەستوورە باریبوو، ئارەقەی ترسێک بەسەر پێستیەوە نووسابوو. بەسەر ئەو ماڵانەدا دەگەڕا کە دەرگاکانیان کراوە بوو، یان باشتر وایە بڵێین دەرگـاکـانیـان شـکێنرابوون، زۆربـەی مـاڵـەکـانی باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیسـکان گەڕا، لە ماڵێک مەتارەیەکی سـپی نەوتی بۆ زۆپاکەی لەگەڵ خۆی هێنابوو، لە خەیاڵی خۆیدا دەڵێت: "ئەگەر ئەو خەڵکەی بە دەردی خەڵک جەلەمۆرد چووبن، ئیتر ماڵ و حاڵیان بۆ چییە!"

لە هەندێک ماڵدا چاوی بۆ وێنەی ئەو منداڵانە دەگێڕا کە لە گەڕەک پێشتر ناسیبوونی، تەنانەت لە کەنتۆری جلەکانیشدا چاوی بۆ جلی منداڵان دەگێڕا، بەڵکوو ئەو فانیلە سـوورەی سـەردار بناسـێتەوە، یان شـەرواڵە ڕەشـە کورتەکەی کە سـەر هەردوو ئەژنۆکانی قرنجابوو. پێڵاوی ماڵەکانی دەژمارد، ڕیزی دەکردن و ڕاست و چەپ لەتەنیشت یەکەوە دایدەنان.

پاشـان دەچێت بۆ ماڵی جوانترین ژنی شـوقەکانی ئیسـکان، ئەو ژنەی مەستوورە ڕۆژانە لەسەر ڕێگای دەوەستا، هەندێک جار لێی نزیک دەبووەوە و بۆنی عەترەکەی دەکرد، ئەپارتمانەکەیان لەو ڕیزە باڵەخانەیەدا بوون کە دەکەوتە سەر شەقامی شەست مەتری. پێش ئەوەی بچێتە ناو ئەپارتمانەکە، هێواش لەژێر لێوەوە گوتی: "ماڵی پاکیزە خان، ژنانی گەڕەک ئاوایان پێ دەوت!"

لە چوونەژوورەوەیدا هەسـتی کرد سـیبەکانی پڕ بوون لە بۆنی گوڵەباخ، هەر چەند دەرگا و پەنجەرەی ئەپارتمانەکە لەسـەرپشـت

بوون و ناو ماڵەکە پڕ بووبوو لە خۆڵێکی زەردباو کە هەموو شار بۆنی ئەو خۆڵەی گرتبوو، بۆنێک کە هەناسەی توند دەکرد و وەکوو بۆگەن و دووکەڵی سووتانێک بە مەلاشوویەوە نووسابوو، تۆزێکی وردی بۆگەن لەناو سپییەکانیدا پەنگی خواردبوو، مەستوورە وای دەزانی ئەو بۆگەنە لە دووکەڵەکەی سەر قەلاتێوە دێت.

لە ماڵی پاکیزە خان لە کەنتۆری جلەکاندا عەزییەکی سپی دەبینێت، عەزییەکە گوڵەباخی سووری لەسەر بوو، دەموچاوی لە ڕووی عەزییەکە و ناو گوڵەکان دەنێت و بۆنی پێوە دەکات، لەبەر خۆیەوە دەڵێت: "وا بزانم ئەم عەزیەم لە بەری پاکیزە خاندا بینیوە، ژنێکی باڵابەرز، قژی ڕەش و درێژ، پێڵاوی پاژنەبەرز و پاوانەی زیوین، خۆیەتی، ئێستاش وەکوو خۆی دێتەوە بەر چاوم!"

مەستوورە پەردەی ماڵەکەی دادایەوە و ماکسییە سوورەکەی خۆی داکەند، پاشان چوو بۆ گەرماوی ماڵەکە و پەڕۆ سپییەکەی لە ناوگەڵی دەرهێنا، ڕەنگە سپییەکەی بە سوور گۆڕابوو، ئاوی بەلوعەکەی بەر دایەوە و تاوێک بوو لەسەر زەویی گەرماوەکە دانیشتبوو، بە نینۆکەکانی خەریکی کرانی خوێنە وشکهەلاتووەکە بوو، زوو زوو دەستی دەخستە بەر ئاوەکە: "ئەم دەردە لەکۆڵم نابێتەوە، وا بزانم ناو جەرگم بووە بە خوێن! دەمکوژێت، بە خوا بەم دەردەوە دەمرم!"

دوای ئەوەی لە گەرمبوونی ئاوەکە نائومێد بوو، ناچار بوو بە جامێکی سووری پلاستیکی ئاوە ساردەکە بەسەر ڕانیدا بڕێژێت، ئەو پەڵە خوێنانەی پاک کردەوە کە بەر چاوی دەکەوتن. کاتێک

هەڵســـــایە ســــەر پێ و بۆ ژووری نووســــتنەکە گەڕایەوە، لە گەرماوەکە کڵۆخوێنەکان خەریک بوو دەخووســــان و ڕەنگی سووریان دەدایەوە. سمتی زیاتر خوێنی پێوە بوو، ڕانی بە پارچە جلێک ســــڕی کە لە ماکســــیی ژنانە دەچوو، تەڕیی چەند دڵۆپە خوێنێک تاوەکوو ســـەر پێکانی جۆگەلەیان بەســتبوو. کاتێک پاکی دەکردنەوە، گوتی: "قوڕ بەسەر خۆم، خۆ ئەگەر بەو هەموو خوێنە بووایە کە لێم دەڕوات، دەبووایە وشــک و ڕەق بوومایەتەوە و دەمێ بوو بمردمایە!"

تاکی کەنتۆری جلەکانی خستبووە سـەر پشت و لە ئاوێنەیەکی لاکێشــــەدا لە بەژن و باڵای ڕووتی خۆی ڕوانی: "لەم نهێنییە تێناگەم، پیر نەبووم و هیچ نەگۆڕاوم، دەڵێیت ئیزرائیل ناوێرێ توخنی من بکەوێت، بزانە ئەو خەڵکە هەموو چۆن لەناو چوون! تۆ بڵێیت ئەو نزایەم گیرابووبێت، کە زوو زوو لەبەر خۆمەوە دڵێم خوایە مەمکوژە تاوەکوو بە خدر و کچەکان شاد دەبمەوە!"

عەزییە سپییە گوڵدارەکەی لەبەر کردبوو، دەســتی لە ڕاســت و چەپییەوە برد نەیتوانی زنجیری ناوشانی عەزییەکەی دابخات، چەند جارێک بەدەوری خۆیدا ســــــووڕایەوە و لە ئاوێنەکەدا لە خۆی ڕوانی، پاشــــان بە ماڵەکەدا لەســــەر نووکی پێکانی دەگەڕا، دوای ئەوە جووتێک پێڵاوی ڕەشی پاژنەبەرزی لەپێ کرد. پێڵاوەکان بە پێی گەورە بوون، قاچی بەدوای یەکدا و لەســـەر یەک ڕاســتە هێڵ هەڵدەهێنایەوە و ڕانەکانی توند لە یەک دەخشــــاندن، دەســــتی لە ڕاســــــت و چەپییەوە لەگەڵ ڕیتمی پێکانیدا ڕادەوەشــــاند، گردی ســـمتەکانی لەگەڵ تۆنی تەقەتەقی پێڵاوەکاندا دەجوولاند. تاڵی قژە

سووره شەوقدارەکەی لەسەر شان و سەر سنگی، تێکەڵی ڕەنگی گوڵەباخەکە بووبوون. زوو زوو دەگەڕایەوە بەردەم ئاوێنەکە و دەستی بەسەر ڕان و سەر مەمکەکانیدا دەهێنا، لێوەکانی سوور کردبوون و سەرپۆشێکی تەنکی لە ڕەنگی گوڵەباخەکە بەسەر شانەکانیدا دابوو. چەند جارێک تاوەکوو دەرەوەی باڵەخانەکە چوو. عەزییەکەی تا سەر شانەکانی ڕووت و تاوەکوو سەر ئەژنۆی کورت، بەردەوام دەستی بە شانە ڕووتەکانیدا دەهێنا، لە خۆی دەڕوانی کاتێک بە خۆی گوت: "مینا و گوڵە چەند جارێک جلی تازەیان بۆ کڕیم و بۆیان هێنام، بەڵام لە ترسی بایز نەموێرا لەبەریان بکەم، یان خۆم دڵم بەرایی نەهێنا ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاوا خۆم بگۆڕم. لە ڕاستیدا نەمدەوێرا پرس بە شێخ بایز بکەم، دەمزانی وەک کەڵەشێر سواری سەرم دەبێت. جارێکیان وتم حەزم لە جلی سفوورە، کەچی قاقا پێکەنی و پێی گوتم زۆر لەسەری بڕۆیت، دەتنێرمەوە بۆ لای خدری مێردت! ئەو بێشعوورە دەیزانی خدر بە چ دەردێک چووە، بەڵام ئیتر وەکوو گاڵتەپێکردنێک ئاوای پێ دەگوتم."

گەڕابووەوە و لەبەردەم پەنجەرەی مەتبەخی ماڵی پاکیزە خاندا لە شەقامەکە و لەوێوە لە ماڵەکانی گەڕەکی سەیداوەی ڕوانی، دیوار و سەربانی ماڵەکان ڕەنگی زەردی خۆڵە بارییەوەکەیان گرتبوو. لە مەتبەخەکە قاپێکی پڕ لە برنج کە بە دۆشاوی تەماتە سوور کرابوو، لە لاوە چەند کەوچکێکی لێ درابوو، هەندێک لە دەنکە برنجەکان سەوز هەڵگەڕابوون کە پێدەچوو کەڕوویان کردبێت، لەتەنیشتی قاپەکەوە پەرداخێکی نیوەپڕ لە ئاو دانرابوو،

مەستووره دوای ئەوەی بۆنێکی بە برنجەکەوە کرد، دەستی بە لووتیەوە گرت، قاپ و پەرداخەکەی شۆرد و خستنیەوە ناو تاکی کەوانتەرەکەوە.

چووبوو لەپێش دەرگای ئەپارتمانەکەدا ڕاوەستابوو، هەوایەکی گەرم و خۆڵاوی دەیدا بە ڕوویدا و دەستی توند لە یەکتر هەڵپێکابوون و هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا، قژە سوور و تەنکەکەی شنەی باکە دەیشەکاندەوە، بیری لەوە دەکردەوە ئاخۆ دایکی کاتی خۆی چیی دەگوت کاتێک جادووی لە کەسێک یان گیاندارێک بکردایە، پاشان کە دەیویست لە جادوویەکی پەشیمان ببێتەوە. مەستووره وەکوو لە خەیاڵی خۆیدا بانگی دایکی بکات، دەنگی هەڵبڕی: "فریام بکەوە، خوا تۆ بگرێت چۆن منت فێری ئەم جادووگەرییە کرد، دیارە ئاسانە جادوو لە خەڵک بکەیت، بەڵام پەشیمانبوونەوە لێی ئەستەمە!"

چاوی نووقاندبوو، هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا، هەوا گەرمەکە بۆنێکی تێکەڵ بووبوو کە مەستووره نەیدەتوانی هیچ ناوێکی لێ بنێت، بەردەوام قورگی دەکزاندەوە و هەستی دەکرد سییەکانی ئاوسابوون، هەردوو دەستی توند بە لێواری ئاسنی پەرژینی بەردەم ئەپارتمانەکەوە گرتبوو، لە گەرماندا شەلاڵی ئارەق بوو، زیاتر لە کاتژمێرێک لەوێدا ڕاوەستابوو، بیری بۆ ڕابردووی دەگەڕایەوە. پێش ئەوەی بڕوات، گەڕایەوە ژوورەوە و بەسەر ماڵەکەدا گەڕا، زەویی گەرماوەکەی لە خوێنەکەی خۆی پاک کردەوە، دەرگای کەنتۆرەکەی داخستەوە. کاتێک ماڵی پاکیزە خانی بە جێ هێشت، عەزییە سپییە گوڵدارەکەی هێشتا لەبەردا بوو،

ماکسـییە سـوورەکەی خۆی بە دەسـتەوە بوو. ناو شـار ڕووناک بووبووەوە و لەوێوە تاوەکوو سەر قەڵاتێی لێوە دیار بوو، دیسان چاوی چووە سەر ئەو ئاگرەی لەسەر قەڵاتێوە دووکەڵەکەی بەرز دەبووەوە، دووکەڵێکی ڕەش وەکوو گێژەڵووکە لوولی کردبێت و بە شینایی ئاسماندا بردبێتی، وەک کۆڵەکەیەکی ئەستوور لە سەر زەوییەوە هەتا چاو بڕ بکات لە بەرزیدا لە کەشـــکەڵانی ئاسـمان چەقیبوو.

# ٢٣

دایکی کراسێکی ڕەشی لە بەردا بوو، تیشکی خۆرەکە لە قوولایی ڕەنگی قوماشە ڕەشەکەدا شەوقی خۆی ون دەکرد، لەسەر سورمەی سپیی قەراغی سەڵتە ڕەشەکەیدا دووبارە شەوقی دەدایەوە. سەرپۆشێکی ڕەشی بەسەردا دابوو، کە قژە سووورە لوولەکەی لەملاولاوە لێوەی هاتبوونە دەرەوە. خۆی هەڵبڕیبووە سەر نووکی پێکانی و گرێی لە تەنافە پچڕاوەکە دەدایەوە. فەقیانەکەی لە پشتی ملیدا گرێ دابوو، کە کراسەکەی تا سەر مەچەکی هەڵدەماڵی. مەستوورە سەردەست و بازووەکانی بینی چۆن شین هەڵگەڕابوون، سەر ڕوومەتی وەکوو پشیلە چنگی لێ دابن. مەستوورە تەمەنی دوازدە ساڵان بوو و سەری تاوەکوو شانی دایکی گەیشتبوو، بەڵام بەردەوام دەستی بە پزووی دەرپێکەی دایکیەوە بوو، زۆر جار خۆی لە پشتیەوە دەشاردەوە

وەکوو بیەوێت چاوشـــارکێ لەگەڵ یەکێکدا بکات، دەســـتی لێ بەر نەدەدا و لە ڕاســـــتەوە لەگەڵی بۆ چەپ دەچوو، زوو زوو لەبەر خۆیەوە: "دایکە..."

بێ ئەوەی بەردەوام بێت یان هیچ پرســیار و داواکارییەکی لێی هەبێت، لە کاتێکدا بانگی دەکرد کە گوێی لە هەنســـکهەڵکێشـــانی دەبوو، یان تنۆکی فرمێســـکەکانی دەبینی بەســـەر ڕوومەتیدا گلۆر دەبوونەوە. دایکی دوو ســـاڵێک لەو تەمەنەی ئەو گەورەتر دەبێ کاتێک بەشـــــووی دەدەن. دوای ئەوەی پچڕاوی تەنافەکەی گرێ دایەوە، لە تەشتێکی فافۆندا ڕانک و چۆغە شۆڕاوەکانی هەڵخست. لەگەڵ هەڵخستنی هەموو پارچە جلێکدا، دەستی پێدا دەهێنا و لەپێ دەســـــتی لەودیویەوە ڕادەگرت و لەبەر تیشـــــکی خۆرەکەدا لێی دەڕوانی، پاشـــــان لەژێر لێوەوە و وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "خوێنەکە بواردوویەتی!"

دوو شەرواڵ و چۆغەیەکی لە تەنافەکە داگرت و خستنیەوە ناو تەشتە فافۆنەکە. مەستوورە هێشتا دەستی لە دایکی بەر نەدابوو، تا ئەو کاتەی پیاوێکی بالابەرز کە شـــەرواڵێکی بۆر و چۆغەیەکی ڕەشـی لەبەردا بوو، خەریکی بەستنەوەی فەقیانە سپییەکانی بوو: "هەی ســـــەربەبەلای دەمرەش، ئەوە دۆعاکانت هاتنە دی، دەمیش دەکەیتەوە و دەڵێیت ئەوەش قەدەری ئێمەیە، ئەوەتا بزانە چۆن دۆعاکانت هاتنە دی و بۆخۆمان بێ ئەولاد ماینەوە!"

مەستوورە لە پشتی دایکیەوە لە پیاوەکەی ڕوانی: "باوکە..."

"ماڵوێران خۆم، چۆن وەجاخکوێر مامەوە!"

کاتێک باوکی مەستوورە ئەمەی گوت، دایکی دایە پڕمەی گریان و فەقیانەی کراسەکەی لە ملی داگرت، بە ڕووی دەموچاویەوە گرتی و فرمێسکەکانی پێ سڕی، لە مێردەکەی ڕوانی و دەستی بە سەری مەستوورەدا هێنا. سەری هەڵبڕی و لە دایکی ڕوانی: "بۆ تایەر و سەرحەد دەگرییت؟"

دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕۆژە، هەردوو براگەورەکەی مەستوورە بەسەربڕاوی لەنزیک ئاوایی ئاوبارە دۆزرانەوە، ئەویش دوای ئەوەی بزن و کەرەکەیان دەمەوئێوارەی ڕۆژی پێش ڕووداوەکە بێ شوانەکان خۆیان بۆ ناو ئاوایی دارەقووتە گەڕابوونەوە، کەرەکەیان توێشەبەرەی خواردن و قۆری و کترییەکەی هێشتا بە پشتەوە بوو. ئەو شەوە تاوەکوو دەمەوبەیان، خەڵکی گوند بەو کێو و هەردەدا گەڕابوون. پاشان سەگەکانی ماڵی مەستوورە براکانیان دۆزیبووەوە، کە لاشەکانیان بەتەنیشتی یەکەوە بێ سەر کەوتبوون.

لەو ساڵەدا لەو گوندانەی ناوشوان و تاوەکوو دەگەییەوە دێهاتەکانی قەرەداغ و گەرمیان، لەلایەن پیاوانی میرییەوە کە پێیان دەوتن "حەرەس قەومی"؛ بەو دەردە بران، سەریان دەبڕین و کەللەسەرەکانیان بۆ مەخفەری پۆلیس یان سەربازگەکان دەبردن، بەو کەللەسەرە پاداشتیان وەردەگرت. خەڵکی گوندەکان لەو نهێنییەی میری سەریان سوڕمابوو کە شوانەکانیان بە یاخی و دوژمنی میری دەزانی، یان بۆچی کەللەسەری شوانێک دەبێ میری ئەوەندەی پارە لە پێناودا بدات!

کاتێک مەستوورە ئەمەی بەبیر هاتەوە، لە دوو بزنی ڕەشی توکنی باریکەلەی دەڕوانی کاتێک بەسەر درەختی بەردەم باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیسکاندا دەگەڕان و خۆیانیان پێدا هەڵدەزنی و گەڵاکانیان دەخوارد. لەبەردەم دەرگای باڵەخانەکەدا دانیشتبوو، بەیانیی زووی ئەو ڕۆژە وەکوو هەموو ڕۆژەکانی تر هاتبووە ئەو جێگایە، کە لەتاو ئازاری ناو سکی نەیدەزانی ڕوو لە کوێ بکات. تاوەکوو ماندوو دەبێت بانگ لە کتە دەکات، پاشان بینینی ئەو دوو بزنە بە خەیاڵ مەستوورەیان بۆ سەردەمی منداڵی گێڕابووەوە، کاتێک ماڵی باوکی لە گوندی دارەقووتە دەبێ، بەڵام دوای ئەوەی گوندی دارەقووتە ساڵی ١٩٦٣ لەلایەن حەرەس قەومییەکانەوە هێرشی دەکرێتە سەر و وێران دەکرێت، ماڵی باوکی مەستوورە ڕوو لە چەمچەماڵ دەکەن، پاشان دوای دوو مانگ بۆ بەخێوکردنی بزنەکانیان ڕوو لە گوندی جەلەمۆرد دەکەن و لەوێ خانوو دروست دەکەن. مەستوورە لەچکێکی دابوو بە سەریدا کە لە ڕەنگی شینی جزمەکانی دەچوو، لچکی لەچکەکەی توند لەژێر ملیدا بەستبوو. دوای ئەوەی ڕووی لە بزنەکان وەرگێڕا، سەرنجی چووە سەر نووسینی سەر دیوارەکان، زۆربەی دیواری باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیسکان بە سوور نووسرابوو، کە پێدەچوو شەوی پێشوو نووسرابن. هەر دیوارێک و ناوێک یان وشەیەکی جیاوازی لەسەر بوو، لە دوورەوە هەوڵی دەدا سەرنجی لەسەر نووسینەکان ڕابگرێت و بەحونجە بیانخوێنێتەوە: "و-ڵا-ت... م-ن... س-بە-ی-ن-ێ... خە-م-ی ئ-ێ-مە..."

هەندێک لە نووسینەکان ئەو بۆیە سوورەی پێی نووسرابوو؛ چۆڕابووەوە، بە جۆرێک کە بەئاسانی نەدەخوێنرانەوە. لەپێش چاوی مەستوورەدا بۆیەی سووری نووسینەکان لە خوێن دەچوون. بە درێژایی ئەو بەیانییە دەستی بە سکیدا دەهێنا، زوو زوو دەستی دەبرد و لەژێر کراسەکەیەوە توند پێستی ورگی دەگرت، پاشان چاوی نووقاند و خۆی بەسەر ئەژنۆکانیدا چەماندەوە. سەری خستبووە نێوان ئەژنۆکانی، لەبەر ئازاری سکی؛ جار جار نووزەیەکی لێوە دەهات. دەستی شۆڕ کردەوە و خستیە ناو دەرپێکەی. لەو کاتەدا کە مەستوورە بێئاگا بوو لە خۆی، سەگە شەلە سپییەکە لەوسەری کۆڵانەکەوە هات و لە بەردەمیدا وەستا، تاوەکوو ئەو کاتەی زمانی بە سەر دەستی مەستوورەدا نەهێنا، ئاگای لە هاتنی نەبوو. مەستوورە لەگەڵ تێپەڕبوونی پێچی ئازارێک بە بەر میزەڵانیدا، دەنگێکی لێوە هات کە زیاتر لە زریکەی منداڵێک دەچوو. ئازارێک کە وەکوو ناوی خۆی دەیناسییەوە، لەگەڵیدا ڕاهاتبوو، لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە بەردەوام ئەو ئازارەی بۆ دەهات و خوێنی لێ دەڕۆیشت.

کاتێک هەستی بە زمانی زبری سەگەکە کرد، بێ ئەوەی بشڵەژێت، هێواش سەری هەڵبڕی و بۆ یەکەمین جار لە نزیکەوە لەگەڵ ئەو گیاندارەدا کە هەستی دەکرد چاودێریی دەکات، هەمووی بستێک لە یەکەوە دوور بوون، چاویان لە چاوی یەکتری بڕی. مەستوورە لەژێر لێوەوە گوتی: "دڵنیام تۆ توخماتت لەوانی تر جیاوازترە، لەوەتەی وەبیرم دێت لە کاتێکدا ئازارم هەبووە،

هەموویان لێم دوور کەوتوونەتەوە و پشتیان تێ کردووم، تەناتەت کتەش!"

دەستێکی لەنێوان ڕانەکانیدا بوو، دەستەکەی تری خستە سەر سەری سەگەکە و پێی گوت: "بە چ ناوێک بانگت بکەم؟"

قووڵ لە چاوی یەکتریان ڕوانی، وەکوو هێشتا دڵنیا نەبن لە یەکتری، هەر چەندە وەکوو دوو گەڕۆکی تەنیا لەو شارەدا بەردەوام چاودێریی یەکیان دەکرد و بەدوای یەکەوە بوون. لەو کاتەدا مەستوورە لە سەگە شەلەکەی ڕوانی و پێی گوت: "تۆ وەکوو مەجیدە شەلی دراوسێم بە ڕێگادا دەڕۆیت، ڕەنگی چاویشتان لە یەک دەچێت!"

کاتێک مەستوورە ئەمەی گوت، ئازارێک لەبەر میزەڵانیەوە هەڵکشا بۆ ناو ئەندامەکانی لەشی، چاوی نووقاند و لەتاواندا سەری خستە سەر سەری سەگەکە، پڕ بە قورگی قیژاندی، سەگەکەش لەگەڵ زریکەکەی مەستوورەدا وەڕی. زوو زوو مەستوورە لەتاو ئازار دەنگی هەڵدەبڕی، ئەویش لەگەڵیدا دەوەڕی و هەندێک جاریش دەیقروسکاند، پێکەوە ئەو گەڕەکەیان لە دەنگی خۆیان پڕ کرد.

دوای ئەوەی مەستوورە بێدەنگ بووبوو، سەری خستبووەوە نێوان ڕانەکانی. سەگەکە دیسان سەر دەست و ناوچەوانی مەستوورەی دەلستەوە، چەند جارێک لەتاو ئازار؛ دەستی بە ڕووی سەگەکەوە نا و لە خۆی دوور خستەوە: "مەجی، بڕۆ بە ڕێگای خۆتەوە، تاوەکوو تۆشم تووشی بەڵایەک نەکردووە!"

کاتێک مەجی دیسـان لێی نزیک بووەوە و بۆنی بە ناو لەپی دەستی مەستوورەوە کرد، لەژێر لێوەوە و وەکوو بیەوێت لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "دەبێ خەتاکە بنێمە مل کێ؟ دۆعای من بوو یان جادووەکەی دایکم بە جێی خۆی گەیشـتووە، یان هەموو ئەو ڕووداوانەی ئەوسا و ئێستاش قەزا و قەدەر بوون و لە چارەماندا نووسـراون؟ منیش لە بەدبەختیی خۆمدا خەیاڵم بۆ لای هەموو شتێک دەچێت، یان پێشوەخت هەموویان بە خەون دەبینم."

تاوێک بێدەنگ لە چاوی سـەگەکەی ڕوانی، خۆی لێ نزیک کردەوە و وەکوو بە گوێیدا بچرپێنێت: "شـکور چاوەکانی تۆ دەبینێت!"

مەستوورە خەیاڵی هێشتا لەلای ڕۆژی کوژرانی براکانی بوو، وەکوو بیەوێت بۆ سـەگەکەی بگێڕێتەوە: "دەزانی مەجی، ئەو بەیانی زووەی براکانم ویسـتیان لەگەڵ ڕانەبزنەکەدا لە ماڵ دەربچن، دایکم ڕێگای پێ گرتن و داوای لێ کردن کە نەڕۆن، بەڵام ئەوان کەی گوێیان لە دایکم دەگرت! دایکم وتی خەونم دیوە و پیاوخراپ سەرتان دەبڕن! دایکم ئاوای پێ وتن، کەچی ڕاستی کرد و ئەوە ڕووی دا. پاشان باوکم خەتاکەی دەخستە ئەستۆی دایکم و پێی دەوت: 'جادووگەری دەمرەش، ئەگەر تۆ ئەوەت پێ نەوتنایە...' بەڵام دیار بوو دایکم خەونی پێوە بینیبوون. نازانم براکانم چ تاوانێکیان کردبوو، یان بۆچی بە سەربڕین سزا دران! دایکم دەیوت ئەو دوو کوڕە خوا بۆ شوانی دروستی کردبوون، دایکم ڕاستی دەکرد، چونکە هەردووکیان خەونیان بەوەوە دەبینی کە ماڵۆچکەیەک پێکەوە بنێن و ژنێک بێنن. لەگەڵ ئەوەدا باوکم

گفتی ئەوەی پێ دابوون سەر و چوار سەر بزنیان پێ بدات، ئەوە تەنها شت بوو کە ئەو دوو کوڕە لە پێناویدا دەژیان. بە نەمانی ئەوان، باوکم دڵی شکا و بەتەنیا مایەوە، چونکە تەنها ترووسکایی لە ژیانیدا؛ کوڕەکانی بوون. لە ماڵی ئێمەدا بەردەوام دوو بەرە بووین، کاتێک دایکم لەگەڵ باوکم شەڕیان دەبوو، براکانم لەپێش باوکمەوە پەلاماریان دەدا، ئەویش هیچی پێ نەدەکرا بێجگە لەوەی دانیان لێ جیڕ بکاتەوە و نزایان لێ بکات. پاشان دوای هەموو شەڕێک و دۆڕانێک، لە سووچێکدا خۆی گرمۆڵە دەکرد و لەژێر لێوەوە نزای لە باوکم و براکانم دەکرد. دایکم هەندێک جار بە ناخێری گیانی، داخی دڵی خۆی بە من دەڕشت و نزای لێ دەکردم کە ڕسوا و بەدبەخت ببم. ئەوەتا وەکوو چۆن ئەو پێی گوتم، وەکوو خۆی هاتووەتە دی و بگرە خراپتریش."

هەڵسابووە سەر پێ و لە مەجیی ڕوانی. هێشتا دەستی لەناو دەرپێکەیدا بوو، بە دەستەکەی تری لە گیرفانی پاڵتۆکەی چنگێک نانەڕەقەی وردکراوی دەرهێنا و بۆ مەجیی ڕاگرت. مەجی دوای ئەوەی بۆنی بە نانەکەوە کرد، سەری شۆڕ کردبووەوە و ڕێی لای ڕاستی مەستوورەی گرتە بەر و چوو لەوسەر کۆڵانەکە وەستا. کۆتایی کۆڵانی بەردەم باڵەخانەکەی ماڵی مەستوورە؛ شەقامە شەست مەترییەکە بوو، لەوێوە ئاوڕی دایەوە و لە مەستوورەی ڕوانی. مەستوورە کاتێک نانەکەی کردەوە گیرفانی: "گەڕی نابووت، لەوانەیە تۆ خواردنی باشتر شک بەریت!"

بینیی شوێنەواری خوێن لەسەر خۆڵە باریوەکە بەجێ مابوو، کاتێک لێی ڕوانی، دەستی لە دەرپێکەی دەرهێنا، لەنێوان پەنجەکانی

و ناولەپی دەســــتی خوێنی پێوە بوو، چوو لای دیوارەکە و دوای ئەوەی ئەو نووســــینەی لە بەردەمیدا ڕاوەســــتابوو خوێندیەوە، پاشــان دەســتی خوێناویی بەســەر بۆیەکەدا سـڕی کە نووسـرابوو "وڵات".

مەجی بەردەوام بەدوای مەسـتوورەوە بوو، بێدەنگ لەتەنیشـتی یەکەوە دەڕۆیشــتن، مەســتوورە لەبەر خۆیەوە گوتی: "مەجی، تۆ سەربازەکانت بینی؟ تۆ بڵێیت ئەوانە لە توخماتی چی بن؟"

گەیشــــتنە بەردەم دەرگای باڵەخانەکە، مەجی نەویســــت لە دەرگاکە لەگەڵ مەسـتوورە بچێتە ژوورەوە، ئەویش پڕی پێدا کرد و پێسـتی پشـتی ملی گرت، تاوەکوو بەردەم دەرگای ئەپارتمانەکە دەســتی لێ بەر نەدا، لێی ڕوانی و بە مەجیی گوت: "تۆم بە ناوی ئەو دراوسێیەمانەوە ناو ناوە، ئەوە ماڵەکەیەتی، خوا دەیزانێت ئەو قوڕبەسەرە چیی لێ بەسەر هاتبێت!"

کاتێک ئەمەی گوت، دەستی بۆ ماڵی مەجیدە شەلی دراوسێیان درێژ کردبوو. پـاشـــــان دەرگـاکـەی کردەوە و بـەدوای خۆیـدا سەگەکەی بۆ ژوورەوە ڕاکێشا.

مەســتوورە لە مەتبەخەکە جامی پشــیلەکەی پڕ کرد لە ئاو و مشــتێک نانەڕەقەی تێ کرد، کاتێک لەســەر زەوییەکە لەبەردەمی مـەجی دایـنـا، بـەدیـاریـەوە چیچکـەی کرد و لێی ڕوانی. مـەجی نەوەســــتا تاوەکوو نانەکە بخوســــێت، یەک یەک نانەڕەقەکانی دەردەهێنا و لەنێوان کـەلـبـەکـانیدا وردی دەکردن، مـەســــتوورە دەستی هێنا بە سەریدا و پێی گوت: "تۆ لە کتە ناچیت!"

## ٢٤

مەســـتووره هەردوو پێی لە لێواری ئاســـنی خواررووی تەختی خەوەکەی گیر کردبوو، دەســـتی توند بە قەراغی دۆشـــەکەکەوە گرتبوو، هەناســـــەبڕکێی پێ کەوتبوو، بە دەم خەوەوە: "نەکەیت! کوڕە شتی وا نەکەیت! نا... نا لەوە زیاتر... ئاخر بۆ خاتر... نەکەیت کوڕە! بۆ خاتر خوا! خوام کرد بە گژتا! خوا غەزەبت لێ بگرێت! بۆ خاتر خوا! نەکەی! نەکەی!"

دەگریا و هەناســەی توند بووبوو، مەجی لە خەو بە ئاگای هێنا، خۆی لە دەموچاوی هەڵدەســووی و جاروبار زمانی بە ڕوومەتیدا دەهێنا. کاتێک لە خەو ڕاپەڕی و هۆشـــی هاتەوە بە بەر خۆیدا، لیکی دەمی مەجی و فرمێســـکەکانی مەســـتووره تێکەڵ بووبوون، پاشـــان مەجیی لە باوەش گرت و بەدەم هەنســـکهەڵکێشـــانەوە پێی گوت: "لەو بەڵایە ڕزگارت کردم!"

کاتێک مەجی؛ مەستوورە بەو حاڵەوە دەبینێت، هەردوو بەتانییەکەی بۆ سەر زەوییەکە ڕادەکێشێت، پاشان دەچێتە سەر تەختی خەوەکەی و زمان بە دەموچاویدا دەهێنێ. پاشان مەستوورە لەو خەونەی ڕادەپەڕێت و ڕاست لەسەر تەختی خەوەکەی دادەنیشێت، دەموچاوی لەنێو لەپی دەستی خۆی دەنێت و بە دەنگی بەرز دەگری. مەجی زوو زوو لووتی لەناو قژی مەستوورە دەنێت و بۆنی پێوە دەکات. هەموو جارێک بەدەم گریانەوە وەکوو خۆی بلاوێنێتەوە:

"وەی لە خۆم ڕۆ! لە خۆم ڕۆ!
خەمێکم هەیە و جەرگی بڕیوم
بووە بە دەرد و گیانی تەنیوم
ماڵی وێرانم بێ کەسوکارم
زەلیل و داماو وا دوورە ماڵم
وەی لە خۆم ڕۆ! لە خۆم ڕۆ!"

ئەو بەیانییە زیاتر لە کاتژمێرێک بەو جۆرە گریا، دیار بوو هێشتا خەیاڵی لای خەونەکانی بوو، دوای ئەوە بێدەنگ ساتێک مەجیی لەباوەش گرت، مەجی فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتی لستەوە، پاشان چوو بۆ مەتبەخەکە و وەکوو خوویەکی ڕۆژانەی، لەبەر بەلوعەکەدا دەموچاوی شۆرد و دوو قوم ئاوی خواردەوە:

"مەجی، تۆ نازانیت من هەموو شەوێک چ خەونێک دەبینم، قوڕ بەسەر من بۆ ژیانێک کە ژیام، بۆ دەردیسەری مامەوە!"

پەردەکانی لا دابوو، گەڕابووەوە سەر تەختی خەوەکەی و مەجی لە تەنیشتیەوە لەسەر جێگاکە پاڵ کەوتبوو، وەکوو ڕۆژانی پێشوو دووکەڵێکی ڕەش لەسەر قەلاتێوە بەرز دەبووەوە، مەستوورە لەسەر تەختی خەوەکەیەوە سەری لار کردەوە و لەو جێگایەی ڕوانی کە دووکەڵەکەی بۆ دەچوو، دەستی خستە سەر پشتی مەجی و بێ ئەوەی لێی بڕوانێ: "مەجی، دەزانیت کاتی خۆی لە ئاوایی دارەقووتە سەگێکم هەبوو؟"

هێشتا لە دووکەڵەکەی سەر قەلاتێی دەڕوانی، قسەکانی لەژێر لێوەوە و بەهێواشی دەکرد، سەری پەنجەکانی بەناو تووکی سەر پشتی مەجیدا دەهێنا، ئێسقانی بڕبڕەی پشتی دیار بوو، پەراسووەکانی لەژێر پێستەکەیدا دەبینران، سەگێکی سپیی دەم باریکی لاوازی بالابەرز بوو، کە لەوە دەچوو ڕەگەزی لەنێوان تانجی و هەوشاردا بێت. مەستوورە زوو زوو سەری لار دەکردەوە و لە چاوی مەجیی دەڕوانی، پاشان ئەو بەسەرهاتەی خۆی ئاوا بۆ مەجی گێڕایەوە:

"سەگەکەم ناوی بازە بوو. من تەمەنم پێنج ساڵان بوو کاتێک یەکێک لە سەگەکانمان ترەکیبوو، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە تووتەڵەیەکی ڕەش و سپیم لە نێوانیاندا هەڵبژارد، ئەوانی تر هەموویان بۆر بوون، باوکم تووتەڵەکانی تری هەموو بەخشینەوە. ئەوەی ڕاستی بێت دایکم ئەو ناوەی لێ نا. باوکم وتی ئەو گەماڵە بۆ خۆمان هەڵدەگرین. لە سەرەتاوە هەردووکمان بچکۆلانە و بزێو بووین، پێکەوە بەردەوام یاریمان دەکرد. کە باوکم و براکانم لە ماڵەوە نەدەبوون، دەمهێنا بۆ ژوورەکانی سەرەوە، بگرە بۆ

ژووری میوان و تەنانەت ناو جێگاکانیش، دایکم گوێی بە قسەی باوکم و ئەوانی تر نەدەدا. کاتێک باوکم و براکانم لە ماڵەوە دەبوون، بۆم نەبوو دەست لەو تووتەڵەسەگە بدەم، بەڵام کاتێک ئەوان دەڕۆیشتن، بەردەوام بە باوەشمەوە بوو. لەپێش چاوی گەورەکاندا من و بازە وەکوو یەک هاروهاج بووین. باش بەبیرم دێت بازە زۆر زوو گەورە بوو، کاتێک من تەمەنم بوو بە شەش ساڵ، ئەو تەمەنی خەریک بوو دەبوو بە ساڵێک، دەستم بە تووکی پشتیەوە دەگرت و بەدوای خۆیدا ڕایدەکێشام. من لەچاو ئەودا بە بچووکی مامەوە و ئەو بوو بە گەماڵێکی گەورە و بەهێز، دەنگی گۆڕا و لە دەنگی وەڕینەکەی؛ دڵم دادەخورپا، بەڵام وەکوو دوو هاوڕێی نزیک ماینەوە. دەزانیت مەجی، زمانێکی تایبەت بە خۆمان هەبوو، بەیەکەوە نانمان دەخوارد و بەیەکەوە دەنووستین، دەزانیت چۆن؟ بەدزییەوە لە پشتی گەورەکانەوە بۆ ناو کولانەی سەگەکان دەچووم. ڕۆژێک من بە ڕێکەوت لە کولانەی سەگەکان بووم، کاتێک دایکی بازە لەناکاو دەنگێکی لێوە هات و گیانی دەرچوو، دوای ئەوەی چەند جارێک ڕاموەشاند، دەستم کرد بە گریان. بازە کولانەکەی بەجێ هێشت و ئەو ڕۆژە نەمبینییەوە، تاوەکوو شەو درەنگ چاوەڕوانی بووم، دیار بوو دەمەوبەیانی گەڕابووەوە، چونکە بەیانیی ڕۆژی دواتر لە دەنگە گرەکەی بەخەبەر هاتم. بەبیرم دێت بەردەوام لە شانیەوە دەوەستام و خۆم بە باڵای دەگرت، چونکە دایکم دەیوت تۆ کچیت و ڕۆژانە بەقەدەر دەنکەجۆیەک باڵات درێژ دەبێ. دەزانی مەجی، ئەو ڕووداوەی ئەو ڕۆژەم بۆ زۆر کەس گێڕاوەتەوە! کاتێک پیاوەکانی

قاســـم ئاغا بۆ ناو دێ هاتبوون، ئیتر خۆ هەرچ کاتێک دەهاتن شـــتێک لەناو ئاوایی دەقەوما، ئەو ڕۆژە مەڕێکیان ســـەر بڕی و لەنزیک ئاوایی لە کارێزێک تاوەکوو ئێوارە درەنگ خواردیان و خواردیانەوە، پاشـــان دەمەوئێوارە بەســـەرخۆشـــی بۆ ناو ئاوایی هاتن، ســـەگە داماوەکانیش لە حەوت بنەچەیانەوە ئاوا فێر بوون، ئێوارەی لێ دەهات ئارامییان لێ هەڵدەگیرا و بەدەوری ماڵ و بەر گەوڕەکاندا بۆ پاسکردن دەگەڕان و بەردەوام دەوەڕین، لەو کاتەدا کە پیاوەکانی قاســـم ئاغا هاتبوونە بەر دێ، تومەس ســـەگەکان پەلاماریان دابوون، ئیتر ئەوانیش ئەو ئێوارەیە کەوتنە کوشـــتنی سەگەکان. لەو کاتەدا کە گوێمان لە دەنگی یەکەم فیشەک بوو، من و دایکم لە مەتبەخەکەمان بووین، دایکم قاپەکانی لە دەست کەوتنە خوار و پڕ بە ماڵەکە زریکاندی، لە ترســـاندا لەســـەر زەویی مەتبەخەکە خۆی گرمۆڵـە کردبوو، وەکوو گوللـەکـان بـەر ئـەو کەوتبن، منیش بەسەر دایکمدا نوشتابوومەوە و دەمویست سەری بخەمە ســـەر ڕانم. کاتێک لە حەوشـــەکەی خۆماندا گوێم لە تەقەکردن بوو، هەســـتم پێ کرد، ئازارێک لە دڵمەوە هات و ئەو شـــەوە تاوەکوو بەیانی نەموێرا بچمە ناو جێگاوە، ئەوە بۆ یەکەم جار بوو کە منیش وەکوو دایکم ترسم لە دەنگی گوللەکان هەبێت. ئێوارەیـە تـاوەکوو ڕۆژی دواتر کـەس لـە مـاڵ نـەچووە دەرەوە. ڕۆژی دوایی پێش خۆرکەوتن، لە دەنگەدەنگی باوکم و براکانم بەخەبەر هاتم. کاتێک چوومە دەرەوە، کەلاکی بازەیان خســـتبووە پشـــتی تراکتۆرێک و بردنیان لە دەرەوەی ئاوایی کردنیان بە ژێر خۆڵەوە. دەزانی مەجی، بازە تەمەنی ســـاڵێکی تێپەڕاندبوو. مانگێک

دوای ئەو ڕۆژە، ئەو شـــوێنەی بازە و ســـەگەکانی تریان لێ کردبوون بە ژێر خۆڵەوە، چەند چڵە دارمۆردێکی لێ ڕوابوو کە دایکم وتی پێشتر من لەو جێگایە درەختی دارمۆردم نەبینیوە."

مەستوورە سـەری نابووە سـەر پشـتی مەجی و لە ئاگرەکەی ســـەر قەڵاتێی دەڕوانی: "دەزانی مەجی، حەز ناکەم هۆگرت ببم، دەترسم تۆش ڕۆژێک خۆتم لێ ون بکەیت!"

ســـەری لەســـەر پشـــتی هەڵبڕی و دەموچاوە درێژکۆلەکەی مەجیی خسـتە ناو لەپی دەسـتی و لە چاوی ڕوانی و لێی پرسـی: "خۆزگـە دەمزانی خـەمی تۆ چییـە، چونکـە بـاوەڕ نـاکـەم هیچ بوونەوەرێک بێخەم بێت!"

## ٢٥

دوای نیوەڕۆی ئـەو ڕۆژە چووبوو لـەدەرگـای مـاڵی مـەجیـدە شـــەلی دابوو، دوای ئەوەی دەگەڕێتەوە لە مەجی دەڕوانێت و پێی دەڵێت: "مەجی! مەجی! ئەو مەجیدە شەلەی دراوسێمان کاتی خۆی بەســـەرهاتێکی ســـەیروســـەمەرەی بۆ گێڕامەوە، بەڵام ئێســـتاش مەراقمە، چونکە شێخ بایزی ناموبارەک نەیهێشت قسـەکانی تەواو بکات، دوای ئەوە هەر بۆم ڕێک نەکەوت لەو بارەیەوە پرســـیاری لێ بکەم، تاوەکو بزانم..."

مەســـــتوورە ئەو ڕۆژەی وەکوو خەونێک بیر کەوتەوە کە بۆ یەکەم جار لەگەڵ شـێخ بایزی مێردی؛ مەجیدە شـەلیان ناسـیبوو، مەسـتوورە و شـێخ بایز تازە هاتبوونە ئەو ئەپارتمانە و سـاڵێک بوو بووبوونە ژنومێرد، مەجیدە شـــەل بەمیوانی دێت بۆ ماڵیان.

کاتێک مەستوورە لە مەجیدە شەل دەپرسێت: "کاک مەجید، ژن و ماڵ و منداڵت نییە؟"

مەجیدە شەل لە وەڵامدا دەڵێت: "هەمبوو، ناشکوریی خوا نەبێت ئاوا ئێستا پیر بووم و خۆم بە تەنیا بۆ خەم و دەردیسەری ماومەتەوە. ئەوە بیستوشەش ساڵ بەسەر ئەو لێقەومانەدا تێپەڕ دەبێ و من هەر وا دەزانم ئەمڕۆیە، کە دوای ئەو هەموو ساڵە گێڕانەوەی هێشتا گرانە!"

"ئێ برا، هەموومان ڕۆژی ڕەش و شەڕوشۆڕمان بینیوە، خۆ تۆ تەنها کەس نییت!"

کاتێک شێخ بایز ئەمەی بە لالووتێکەوە بە مەجیدە شەل گوتبوو، مەستوورە لە وەڵامدا بە بایزی مێردی دەڵێت: "ئەرێ بایز، هەر کەسە و خەم و ئازار و لەدەستدانی کەسانی ئازیزی خۆی بە جۆرێکە!"

شێخ بایز لەو کاتەدا هەڵدەسێت و پێش ئەوەی بڕوا، بە مەستوورە دەڵێت: "ئەرێ تۆ بۆ ئەوەندە حەزت بەو باس و خواسانە دێت؟ پێم ناڵێیت تۆ چیت داوە لەو سەرئێشەیە؟"

دوای ئەوەی بایز دەڕوات، مەستوورە لە مەجیدە شەل دەپرسێت: "دەی ژن و منداڵت چییان لێ بەسەر هاتووە؟"

مەجیدە شەل بەدەم چا خواردنەوەوە ئەو بەسەرهاتەی ئاوا بۆ مەستوورە گێڕابووەوە:

"ساڵی ١٩٦٣ بوو، هێشتا ساڵێک نەبووبوو ژنم هێنابوو، ڕۆژی پێشوو ناو شار پڕ بووبوو لە حەرەس قەومییەکان، دەنگۆی ئەوە بڵاو بووبووەوە کە گوایا لە گەڕەکی خانەقا و تەعجیل ئەو

حەرەس قەومییانە کە بەتایبەت لە بەغدادەوە بۆ ناو شاری هەولێر هێنرابوون، لەناو کۆڵانەکانی ئەو دوو گەڕەکە چەند کەسێکیان گوللەباران کردووە. یەکێک لە دراوسێکانمان دەیگێڕایەوە کە لە کۆڵانەکانی گەڕەکی تەعجیل تەقەیان لە منداڵان کردبوو. بزانە، منداڵی تەمەن شەش حەوت ساڵان بە گوللەکانەوە بووبوون! ئەو بەیانییە هێشتا تاریک بوو کە ژیان لە قووڵایی خەو خەبەری هێنام، دوای ئەوەی چاوم هەڵگلۆفین و سەرم هەڵبڕی، لەبەر ڕووناکیی چراکەدا چاوم بە دەموچاویدا هەڵهێنا، زۆر گرژ و مۆن دیاربوو، گلێنەی چاوە ڕەشەکانی؛ ڕووناکیی چراکە دووبارە تێیدا دەگڕایەوە، زوو زوو لێوی خۆی دەگەست، دەستی بەرەو ڕووم درێژ کردبوو، پێش ئەوەی من دەست بدەمە دەستی، ڕۆیشت و بە ژوورەکەدا دەستی بە گەڕان کرد، دیسان گەڕایەوە و چراکەی لەتەنیشتی تەختی خەوەکە و لەسەر فەرشەکە دانا، چوو لای پەنجەرەکە کە هێشتا پەردەکان دادرابوونەوە، دەستی دایە پەردەکە و ڕایکێشایە خوارەوە، ئەوەی ڕاستی بێت وا بزانم دڕاندیشی، پاشان هات و ئاخنییە ئەو کۆڵەپشتەی لەناوەڕاستی ژوورەکەدا دایناببوو، دیار بوو پێش ئەوەی من بەخەبەر بێنێت، شتی تریشی لە کۆڵەپشتەکە کردبوو، چونکە بەزەحمەت پەردە سوورەکەی دەگرت. لە دەرەوە دەنگی خەڵکی گەڕەک دەهات، پاشان لە دوور و نزیک گوێم لە تەقەی تفەنگ بوو، لەبەر خۆیەوە پێی گوتم: 'خێرا بکە با بڕۆین، شار کەسی تێدا نەما!' ئێوارەی ڕۆژی پێشوو هەواڵی هاتنی سوپا بۆ ناو شار لەئارادا بوو، دیار بوو ژیان بە درێژایی ئەو شەوە نەنووستبوو، کاتێک جێگای بۆ

من ڕاخست، منیش لە ترساندا بە شەرواڵ و پاڵتۆکەی بەرمەوە نازانم چۆن خەوم لێکەوت. کاتێک پێڵاومان لەپێ کرد و پێکەوە چووینە بەردەرگا ڕاوەستاین، لە گەڕەکانی ترەوە گوێم لە دەنگی گوللە و جار جاریش تەقینەوە ڕووی دەدا. ئەوە لەبیرم چوو ئەوەت پێ بڵێم، ئەو سەردەمە ئێمە ماڵمان لە گەڕەکی سێتاقان بوو، ئەو شەوە ڕەشەبایەکیش لە گەڕەکەکانی زانیاری و تەعجیلەوە بۆنی باڕووتی دەهێنا. بەردەوام خەڵکی ڕێبوار بەبەردەم ماڵی ئێمەدا تێدەپەڕین، گەورە و بچووک و پیر، هەموو کۆڵیان لە پشتیان داگرتبوو، دراوسێکانیشمان وەکوو ئێمە هاتبوونە بەر ماڵەکانیان و هەندێکیان خۆیان بۆ ڕۆیشتن ئامادە کردبوو، ئەوانی تریش لەو خەڵکەیان دەڕوانی. ماڵەکەی ئێمە لە شاریعی کۆیە بوو، ئەو حەشاماتە بەبەردەم ماڵی ئێمەدا تێدەپەڕین، دەنگی فڕەفڕی هەلیکۆپتەر لە بەرزیی ئاسمانی شار دەبیستران، لەو کاتەدا دەستی خستە ناو دەستم و توند دەستی گوشیم، بێ ئەوەی لێم بڕوانێ، دەستەکەی تری هێنا بە سەر ورگی هەڵئاوساویدا و لەبەر خۆیەوە وتی: 'بڕۆین باشە، تاوەکوو درەنگ نەکەوتووین!' ژیان ئەوسا سکی نۆ مانگ بوو، دەستم لە دەستی دەرهێنا و لەو کاتەدا کە کۆڵەپشتەکەم دەکردە شانم، لێم پرسی: 'ئەرێ دەرگاکانت داخست؟' لە خەڵکەکەی ڕوانی و بێ ئەوەی چاو لەوان بترووکێنێ، تەنها سەری بۆ لەقاندم. کاتێک تێکەڵی خەڵکەکە بووین و کەوتینە ڕێ، هێشتا لە کۆڵانەکەی خۆمان دەرنەچووبووین، باران لە پاڵتۆکەوە دایدا و هەستم بە سەرما دەکرد، ئەویش کونێکی کردبووە ناوەڕاستی سفرەکەمان و کردبووی بە سەریدا،

بەردەوام ئاوی باراناوەکە بەملا و ئەولایدا دەهاتە خوار و هەندێکی بەر من دەکەوت. لەو شەقامەی ئێستا سی مەتریی پێ دەڵێن، ئەو سەردەمەی هێشتا وەکی ئێستای نەبوو، لەو جادەیە دەبووایە سەرەت بگرتایە تاوەکوو تێکڵاوی ئەو خەڵکە دەبوویت، وەکوو ڕووبارێکی بەرین وا بوو کە لە ڕاست و چەپەوە ئەو خەڵکە لە کۆلانەکانەوە دەهاتنەوە سەری، هاوشێوەی جۆگەلە وا بوون و چۆن تێکڵاوی ڕووبارێک دەبن، ئۆتۆمبێل لەناوەڕاستی جادەکەوە بەدوای یەکدا ڕیزیان بەستبوو کە ئەوانیش بەپێی خەڵکەکە ڕێیان دەکرد. بەردەوام لە دوور و نزیک دەنگی تەقینەوە دەهات، کاتێک هەلیکۆپتەرەکان مووشەکیان بەناو شارەوە دەنا، خەڵکەکە هەموو بەیەکەوە هەڵوێستەیەکیان دەکرد و پێکەوە لە تاریکیی ئاسمانیان دەڕوانی، پاشان پێکەوە بە یەک دەنگ دەیانگوت: 'لە دوور داکەوت، مەترسن!' ژیان بەردەوام دەستی دەگوشیم و لەبەر خۆیەوە لووشکەلووشکی گریانیم گوێ لێ بوو، ماندوو دیار بوو، چونکە خۆی بەسەر ورگیدا چەماندبووەوە و گوێم لە خشەخشی پێڵاوەکانی بوو. ئێمە دەبووایە بەپێی ئەو خەڵکە بڕۆشتینایە، کاتێک ژیان هێواشی دەکردەوە، ئەوانەی دوامانەوە دەستیان بە پشتمانەوە دەنا، زوو زوو گوێت لە دەنگی یەکێک دەبوو، ئەوانەی پێیان وا بوو ئەو خەڵکە خێرا ناڕۆن و پێویستە پێ هەڵگرین، جار جار یەکێک توند لەپی دەستی دەدا بە لاتەنیشت و بۆنیتی ئۆتۆمبێلەکاندا و پێیان دەوتن بۆ ئێوەش ئۆتۆمبێلەکانتان بەجێ ناهێڵن و وەکوو ئەو خەڵکە بە پێ بڕۆن! کاتێک گەیشتینە قەراغی شار، لە جادەکە لامان دا و بەدوای ئەو

خەڵکەدا بەو دەشـــتەدا بەدوای یەک کەوتین. لەدوای ئێمەوە، کە بیســت مەترێک لێمانەوە دوور بوو، دەنگی دەســـترێژیی گوللە دەهات، ئەوە بووە هۆی ئەوەی شـیرازەی قافڵەکەمان بشـێویت و هەریەکە و بە لایەکدا بڵاوەیان لێ کرد. کاتێ ئەوانەی دوای ئێمە پاڵیان بە ئێمەوە دەنا، ژیان لە جێگای خۆی دانیشـــت و منیش ناچار بەرم لە خەڵکەکە گرت و چۆکم دادایە سـەر زەوییەکە و بۆ ژیان خۆم کرد بە بەربەســـتێک. ئەو دەگریا و منیش هاوارم لەو خەڵکە دەکرد کە بەســـەر شـــان و ملی ئێمەدا هەنگاویان دەنا و ڕایاندەکرد. لە دوامانەوە تەقەکان لە زیادبووندا بوون، بێجگە لە هاوار و بانگی ئەو خەڵکە. ژیان لەناو قوڕی زەوییەکە کەوتبوو، خۆی بەســـەر ورگیدا گرمۆڵە کردبوو، وەکوو ئەوە وا بوو کە ورگی لەباوەش گرتبێت، منیش بە ســەریدا خۆم چەماندبووەوە و هەردوو دەســـتم بەملا و ئەولایدا چەقاندبووە قوڕەکە، بەو جۆرە نزیکی کاتژمێرێکمان پێچوو. لەو کاتەدا لە دڵی خۆمدا گوتم: 'هەتا ئێمە لێرەدا کەوتبین و ئەو هەموو خەڵکە لە چواردەومان بن، بەر گوللەکان ناکەوین!'

بەڵام زوو زوو یەکێک وەکوو ئێمەی نەبینیبێت، پێی بە قاچ یان پشـــتی مندا دەنا، وەکوو بیەوێت بۆ جێگایەکی بەرزتر ســـەر بکەوێت. کاتێک هەســـتم پێ کرد، خەریک بوو چواردەورمان چۆڵ دەبوو. دەسـتێکم خسـتە ژێر پشـتی ژیان و دەسـتەکەی ترم لەژێر سمتیەوە برد، گورم دایە بەر خۆم و لەباوەشـم گرت و هەسـتامە ســـەر پێ. ئەوەی لەو کاتەدا خەیاڵم لای بوو، دەنگی گوللەکان بوون. کاتێک من چەند هەنگاوێک ڕۆیشـــتبووم، گوللەکان بەرز و

نزم و خێراتر له من دەیانزریکاند و بەلامدا تێدەپەڕین، وەکوو بمەوێت جۆرێک پێشـــبڕکێیان لەگەڵدا بکەم، پێ هەڵگرم و نەیەڵم ئەو فیشەکانەی هێشتا لەناو مەخزەنی تفەگی سەربازەکاندا بوون؛ بگەنە لامان. دەستم کرد بە ڕاکردن، هەستم پێ کرد چەند جارێک منیش بەســـەر لاشـــەی ئەوانی تردا دەڕۆیشـــتم، نەمزانی بەر گوللەکان کەوتبوون یان خۆیان لەبان ئەو زەوییە تەڕە پاڵ خستبوو. گوێم بۆ دەنگی گوللەکان هەڵخستبوو، ئەوەی ڕاستی بێت چاوەڕوانی مردن بووم و لە ترس دەرچووبوو، ساتێکی زۆر ناخۆش بوو من و ژیانی تێدا بووین، دڵنیا بووم لەوەی ســـەربازەکان لە دوامانەوە تەقەیان لێ دەکردین. لەو کاتەدا دەمەوبەیانی بوو، دنیا ڕووناک بووبووەوە، هەورێکی ڕەش بەنزمی بەری ئاسمانی گرتبوو، بارانیش بەلێزمە دەباری، جار جار قاچم دەچەقییە قوڕەکە و بەتووڕەییەوە ئەژنۆم هەڵدەبڕی و قاچم لە قوڕەکە دەردەهێنا و لە ڕاکردن بەردەوام دەبووم، لە پێشـمەوە ئەوەندەی چاو بڕ بکات دەشـتێکی نەبڕاوە بوو، ئەو دەشـتە پڕی بووبوو لە خەڵک و بەو ناوەدا بڵاو بووبوونەوە، هەندێک وەکوو من ڕایاندەکرد، هەندێک لەو ناوەدا خۆیان پاڵ خستبوو، بە جۆرک نەتدەزانی کێ ماوە و کێ بەر گوللەکان کەوتووە! لێت ناشارمەوە، تەنها خەیاڵم لای ڕۆحی خۆم بوو، دەتوانم بڵێم لە ترسـاندا ئاگام لە ژیان نەبوو ئاخۆ بە باوەشـــمەوە چی دەڵێت و حاڵی چۆنە! ڕامکرد، هەتا توانیم ڕامکرد، بەڵام ئەو دەشـــتە پان و بەرینە نەدەبڕایەوە. چاوم لە دوور بڕیبوو، لە کۆتایی دەشتەکە مەبەستمە، وەکوو پێم وتیت تەنها خەیاڵم لەلای دەنگی گوللەکان بوو کە بە

ڕاست و چەپماندا بەردەوام تێدەپەڕین، بارانبارینیش ئەوەندەی تر بارگرانی کردبووم، لەگەڵ ڕەشەبایەکی سارددا بێوچان بەرەو ڕوومان دەهات و هەستم دەکرد یەخەی دەگرتم. ئیتر..."

مەجید تاوێک بوو بێدەنگ بەسەر کۆشیدا سەری شۆڕ کردبووەوە و پیاڵە چا ساردەکەی لەناو دەستی توند گرتبوو، مەستوورە چوو لەلای مەجیدە شەلەوە دانیشت و دەستی خستە سەر دەستی و ویستی پیاڵەکەی لە دەست وەربگرێت، بەڵام دیار بوو مەجید ئەوەندە قووڵ گەڕابووەوە بۆ ئەو ساتە و کاتی ئەو ڕووداوە، ئاگای لەلای مەستوورە نەمابوو، تا ئەو کاتەی لەناکاو پیاڵە شووشەکە لەناو دەستی مەجیدە شەلدا شکا، مەستوورە لەبەر خۆیەوە هاواری کرد: "وەی چی بوو!"

بەڵام مەجیدە شەل هیچ خۆی تێک نەدا و تەنانەت سەریشی هەڵنەبڕی و لە دەستی نەڕوانی. دوای ئەوە مەستوورە پەڕۆیەکی هێنا و پاکەتێک دەستەسڕی کلینکسی لەسەر مێزەکەی بەردەمیان لە خۆی نزیک کردەوە، بایزی مێردی هاتبوو لەتەنیشتی مەستوورەوە وەستابوو لە مەجیدی دەڕوانی، لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەوە چییە! هەڵسە، هەڵسە بچۆ بۆ مەتبەخەکە، با ئەو خوێنە نەسوێت بە قەنەفەکاندا، دوایی خواش لێی ناکاتەوە!"

بایز بەسەر مەستوورەدا دەستی دایە بنباڵی مەجیدە شەل و هەڵیساندە سەر پێ، مەستوورە پەڕۆکەی لەژێر دەستی مەجیددا گرتبوو کە چۆڕاوی خوێنەکەی دەتکایە سەر. مەجیدە شەل لەسەر کەوانتەری مەتبەخەکە دەستی کردەوە، چەند پارچە شووشەیەک لە بەری دەستی چەقیبوون. بایز ڕووی لە مەستوورە کرد و

سەری لێ با دا، مەستوورەش لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەو پیاڵانە ئەوەندە ناسکن، بە خوا زیاتر لە دە جار لە شۆردندا بە دەستمەوە شکاون و چەند جارێک دەستم براون!"

مەجیدە شەل سەری هەڵبڕی و لە مەستوورەی ڕوانی، پاشان سەیری بایزی کرد و گوتی: "توو خوا لە قسوورم عەفووم بکەن."

"ماڵت بەقوڕ گیرێت، وتم ژنەکە ئەم بەڵایەمان لێ لادە، بزانە چی بوو! ئاخر ئەم بەزم و باڵۆرانە نەبڕانەوە، ئێمە چیمان داوە لەو سەرئێشەیە، ئەی تۆ نازانیت من بە بینینی خوێن بێزار دەبم، دڵم تەنگ دەبێ، ئەگەر دڵۆپەیەکیش بێت!"

مەستوورە لەو کاتەدا دەستی مەجیدە شەلی گرتبوو، وردەشووشەی لێ دەردەهێنا، بەلاچاوێک لە بایزی مێردی ڕوانی و بە شانی توند پاڵی بە سنگی بایزەوە نا، بەتووڕەییەوە پێی گوت: "وەی کە تۆ پیاوێکی مەزڵووم و ناسکیت! دە بڕۆ، بڕۆ با تۆ ئەو خوێنە نەبینیت، با دەستە خوێناوییەکانی خۆتت بیر نەکەوێتەوە!"

شێخ بایز وەکوو هەموو جارێک کە تووڕە دەبوو، مەستوورەی بەجێ هێشت. کاتێک مەستوورە پارچەی شووشە شکاوەکانی لە ناو لەپی دەستی مەجیدە شەل دەرهێنا، مەجیدە شەل لە مەستوورەی ڕوانی و چەند جارێک چاوە تەڕەکانی نووقاند، سوپاسی مەستوورەی کرد و وەکوو پەلەی بێت؛ ڕۆیشت.

مەستوورە ئەوەی لە خەیاڵدا بوو کە پرسیاری ئەوە لە مەجیدە شەل بکات ئاخۆ ئەو ڕۆژە تۆ و ژیان بە گوللەکانەوە بوون؟

مەجیدە شـەل ئەو ڕۆژە بەسـەرهاتەکەی خۆی تەواو نەکرد، لە ڕابردوودا مەسـتوورە چەند جارێک هەوڵی ئەوەی دابوو ئەو پرسـیارە لە مەجیدە شـەل بکات ئاخۆ ئەو ڕۆژە چی ڕووی دا و ئایا تۆ و ژیان بەر گوللەکان کەوتن؟ ئەی کۆرپەکەی ناو سـکی ژیان؟

بەڵام ئەوە هەر ڕێک نەکەوت و ئێستاش مەستوورە لە خەیاڵیدا خەمێکە و بەردەوام بیری لێ دەکاتەوە.

لە ڕابردوودا گەلێک جار ئەمەی بە خۆی گوتووە: "تۆ بڵێی ئەو ڕۆژە ژیانی ژنی مەجیدە شـەلی دراوسـێم و منداڵەکەی بەر گوللەکان کەوتبن؟ لێی دەپرسم، ڕۆژێک هەر دێت لێی دەپرسم!"

## ٢٦

لەنێوان دیوارە گڵینەکانی کۆڵانەکانی گەڕەکی عەرەبدا بوو، لەناو تاریک و ڕووندا سەری شۆڕ کردبووەوە و لە سەر سنگ و بەر ورگی ڕووتی خۆی ڕوانی، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و زریکەیەکی لێوە هات و سەیری چواردەوری خۆی کرد، کەسی نەبینی، زوو زوو هەنگاوی بەسەر کورسی، مێز و کەنتۆری شکاو، شتومەکی ماڵەکاندا دەنا کە لەو کاتەدا بەو کۆڵانەدا بڵاو بووبوونەوە، هەموو دەرگاکان کراوە بوون، هەندێک لە دیوارەکان ڕووخابوون، بۆنی دووکەڵی ئاگرێکی دەکرد، چووە بەردەم دەرگای ماڵی حەلیمە زێباری، شۆفێری تاکسییەکان هەموو ناونیشانی ئەو ماڵەیان دەزانی، لە چواردەوری قەلاتێدا لە هەر ڕێبوارێکت پرسیار دەکرد، پێشت دەکەوت و بۆ بەردەم ماڵەکەی دەبردیت. ماڵەکانی ئەو گەڕەکە دەرگاکانیان شکێنرابوو،

مەسـتوورە چووبووە ژوورەکەی مینا و گوڵە کە بێجگە لە بەرەیەکی ڕەنگاوڕەنگ، هیچی تری لێ نەبوو، خۆڵی لێ نیشـتبوو. بەرەکەی تەکاند و لوولی کرد، لە سـووچێکی ژوورەکەوە هەڵیپەسارد. پیاوە بەتاڵ و دەسـتگێڕ و دووکاندارەکانی ناو بازاڕ، ڕووخسـاریان لە دیوارە گڵینەکاندا دیار بوو، لە مەسـتوورەیان دەڕوانی، دەسـتی تووکن و بازووی ئەسـتووریان لە دیوارەکانەوە دەهاتنە دەرەوە، سـەرپەنجەی زبریان بەسـەر پێسـتی ڕووتی مەسـتوورەدا دەهێنا. تاوێک بێدەنگ لەناوەڕاسـتی ژوورەکەدا وەستابوو، چاوی نوقاندبوو، توند لێوی خۆی دەگەست، هەناسەی دەرنەدەهات، خوێنی لە دڵیەوە بۆ ژێر پێسـتی شـەپۆلی دەدا، دەسـتی لێک هەڵپێکابوون و زوو زوو سـەری پەنجەکانی خۆی دەگوشی، ماسوولکەی گردۆڵکەی سمتی گرژ کردبوو، زوو زوو پڕ بە سییەکانی بۆنی پیاوەکانی هەڵدەمژی، تاوێک خدر و پاشان شێخ بایزی لە خەیاڵدا بوو، تاوەکوو ئەو کاتەی ماسوولکەی بەر میزەڵانی گرژ بوون و موچڕکەیەک بۆ سەر سنگی هەڵکشا بێدەنگ قنج ڕاوەستابوو، خۆی هێنابووە سەر نووکی پێکانی و هەناسەی لەبەر بڕابوو، ئارەقەیەکی سـارد بەسـەر پێسـتیدا ڕژا، پاشـان دەنگێکی لەناکاوی لێوە هات و خۆی لە چنگیان ڕاپسـکاند. کاتێک ویسـتی بچێتە دەرەوە، بینیی دیوارەکان لەدوای ئەوەوە دادەڕووخان و دەبوون بە خۆڵەمێش، لەو کاتەدا بۆنی عارەقی ساردی لەشی خۆی دەکرد. کاتێک چووە ناو کۆڵانەکە، کورسییە سوورە پلاستیکییەکەی فارسی کوڕی حەلیمە زێباری هێشتا لەبەر دەرگاکە بوو، لەسـەری دانیشـت تاوەکوو ترپەی دڵی و سـووڕی

خوێنی هێواش بوونەوە. لای دەستەڕاستی کۆلانەکەوە مەجی لە دوور هاتبووە ناوەڕاستی کۆلانەکە و لێی دەڕوانی، دەستی لێ هەڵبڕی و چەند جارێک بانگی کرد: "مەجی! مەجی!"

پاشان بە دەنگی بەرز گوتی: "خۆ تۆش ناهەقت نییە لە شوێنەواری وێرانەی ئەم ماڵە بترسیت!"

ڕۆژی ڕووداوەکە، لە پێشدا فارسی کوڕی حەلیمە زێبارییان لەسەر ئەو کورسییە کوشتبوو، پاشان لە پەنجەرەکەوە دوو نارنجۆکیان خستبووە ژوورەکەی حەلیمە زێباری کە لەو کاتەدا مینا و گوڵە و حەلیمەی لێ دەبێ، ئیتر ئەوان ئاوا کوژران. لە ڕۆژانێکدا ئەو ڕووداوە ڕووی دا، کە لەناو شاری هەولێر ئارایشتگا و ماڵی ژنە بێوەژنەکان تەقێنرانەوە. مەستوورە ئەو هەواڵەی لە دەمی دراوسێکانەوە بیستبوو.

# ٢٧

مەستوورە وەکوو پیشەی هەموو شەوێکی، چەند جارێک لە خەو بە ئاگا دەهات، پاشان لە بەر بەلووعەی مەتبەخەکەی ئاوی دەخواردەوە و دەموچاوی دەشۆرد. هەندێک جار ئەگەر خەونەکەی ناخۆش و بەدڵی نەبووایە، دەچوو لەبەر پەنجەرەکەیدا ڕادەوەستا و لە گڵۆپەکانی ناو شاری دەڕوانی، بەڵام ئەو شەوە کاتێک بەخەبەر هاتبوو، خەیاڵی لە گەڕەکی عەرەب و ناو ژوورەکەی مینا و گوڵە بوو، زوو زوو دەستی بەسەر مەمکەکانیدا دەهێنا و گەندەمووی سەر باڵەکانی ڕاست بووبوونەوە. چەند جارێک شێوازی مینا و گوڵەی هێنایە پێش چاوی، بەدیازی بینینەوەی ئەو دوو خوشکە گەڕایەوە سەر تەختی خەوەکەی و چاوی چووە خەون، بەڵام وەکو گەلێک شەوی تر خۆی لە بیابنێکدا بینییەوە.

دەمەوبەیانیی یەکێک لەو ڕۆژانەی کە شـــاری هەولێر چۆڵ دەبێت، مەســـتوورە بۆ دووکانی کوتاڵفرۆشـــییەکە دەچێت، ئەو دووکانەی بۆ یەکەم جار لەگەڵ شـێخ بایز چووبوو، دووکانی ئەو دوو برایەی بە سکێک لەدایک بووبوون، هێشتا شێوەی قسەکردن و لووتە زلەکەیانی لەپێش چاودا بوو. شـێخ بایز بە مەسـتوورەی گوتبوو: "جوانترین قوماشـــەکانی دونیا، لەم دووکانە دەســـت دەکەوێت!"

بۆ دوا جـار بەزەلیلی چووە ئـەو دووکـانـە، ئـەو دوو پیـاوە لە دەسـت کوڕوکاڵی ئەو شـەقامە ڕزگاریان کرد، بەڵام دیار بوو ئەوان مەستوورەیان نەناسییەوە.

مەسـتوورە هەرچ کاتێک ڕێگای بکەوتایەتە ناوبازاڕ و شـەقامی دەوری قەڵاتێ، بەبەردەم ئەو دووکانە کوتاڵفرۆشـییەدا تێدەپەڕی، لە دەرەوەی دووکانەکە تەنها دەسـتی بە ڕووی زبری یان نەرمی پارچە قوماشــە ڕەنگاوڕەنگەکاندا دەهێنا، پاشـان چەند کاتژمێرێک لە خەیاڵی خۆیدا کراس و سـەڵتە و سـەرپۆشـی بۆ کچەکانی لێ دەدوورین.

شـەقامەکە خۆڵ داپۆشـیبوو، دەرابەی دووکانەکان هەندێکیان داخرابوون، چـەنـد دووکـانێکیش بەکراوەیی بـەجێ هێڵرابوون، تاوەکوو ئەو ساتەش هێشتا دەنگەدەنگی خەڵکەکەی لە گوێدا بوو، چووە ژوورەوە و لە قوماشـــە ڕەنگاوڕەنگەکانی ڕوانی، بەناو ڕەنگی قوماشەکاندا تیشکی خۆر خۆی گەیاندبووە ناو دووکانەکە،

جانتایەک لە بەنی سەوز چنراو بە بزمارێکدا هەڵواسرابوو، کاتێک لێی ڕوانی، ئەوەی بیر هاتەوە کە یەکێک لە دوو براکە بە شێخ بایز و مەستوورەی گوتبوو: "ئەو توورەکە بەنە نوشتەی باپیرە شێخ شەمسی تێدایە، ئەوە دە پشتە پاراستوومانە. هەتا نوشتەی ئەو زاتە موبارەکەمان هەبێت، خوا ئەم شاری هەولێرە لە دەرد و بەڵا دەپارێزێت و ڕزق و خێر ڕوومان تێ دەکات."

مەستوورە توورەکەی نوشتەکەی داگرت و کردیە ملی، لەبەر خۆیەوە گوتی: "بەڵکوو نوشتەی ئەم موشایەخە، منیش لە دەرد و بەڵا بپارێزێت!"

لە ڕەفەکاندا یەک یەک تۆپە قوماشەکانی داگرت، چووبووە بەر ئاوێنەیەکی شکاو، هەندێک پارچە قوماشی تاقی کردەوە و بە باڵای خۆی گرتنی، قژە سوورەکەی و پێستی سپیی لەنێوان ڕەنگی قوماشە ڕەنگاڵەکاندا شەوقیان دەدایەوە. پاشان وەکوو شتێکی بیر کەوتبێتەوە، چەندین تۆپ قوماشی جەلسەی سووری پوولەکەداری جیا کردەوە، پڕ بە باوەشی بۆ دەرەوەی دووکانەکەی بردن، لەلای ڕاستی دووکانەکە خێرا چاوی بە توورکە سپییەکەی مەجی کەوت کە بیست مەترێک لێوەی دوور بوو، لێی ڕوانی بانگی کرد: "مەجی وەرە بزانە چەند جوانن!"

مەجی ئەو ڕۆژە دووراو دوور دوای کەوتبوو، کاتێک مەستوورە تۆپە قوماشەکانی لەناوەڕاستی جادەکەدا دانابوو، مەجی دوورەپەرێز ڕاوەستابوو لێی دەڕوانی. تۆپێک قوماشی هەڵگرت، لە سەرەتای ڕاستەشەقامەکە لچکی قوماشەکەی لە پەرژینی قەراغی بەری دەستەڕاستی شەقامەکە گرێ دا، پاشان بۆ

ئەوبەری برد و تۆپی قوماشـــەکەی لە ئاســنی پەرژینەکە هەڵپێچا، دیســـان بۆ بەری دووکانی کوتاڵفرۆشـــەکەی بردەوە، تاوەکوو کۆتایی شـــەقامەکەی ئەمبەراوبەر بە ڕەنگی ســـوور ڕازاندەوە، تیشــکی خۆرەکە لە ڕووی پوولەکە ســپییەکاندا بە هەزاران جار دووبارە دەبووەوە. مەجی وەکوو لە ڕەنگی ســـوور بترســـێت، بەسەر شۆستەی بەردەم دووکانی کوتاڵفرۆشییەکەدا ڕۆیشت و ســـەری داهێشـــتبوو، ئاوڕی نەدایەوە و چووە ناو کۆلانێکەوە. مەستوورە لەدواوە لێی ڕوانی، قاقایەکی لێدا و بانگی کرد: "پێستی ســـەری تۆش بەنەعلەت بێت، مەگەر تۆش لە توخماتی ئەوان نەبیت!"

گـەڕابووەوە و لـەبـەردەم دووکـانی کوتـاڵفرۆشـــییـەکـەدا ڕاوەستابوو، بێدەنگ لەوسەری شەقامەکەی ڕوانی، لەناوەڕاست و لەژێر سێبەری قوماشە سوورەکەدا بەچیچکانەوە دانیشت و میزی کرد، کاتێک هەڵسـایەوە و لێی ڕوانی، خوێن و میزەکەی تێکەڵ بە یەک بووبوون. "ئەوەندەم بەو خەڵکە وت ناوجەرگتان ببێت بە خوێن، ئەوەتا بزانە خۆم تووشی ئەو دەردە بووم!"

دوای ئەوەی ئەمەی گوت، لای چەپی دووکانەکەی گرتە بەر و بەرەو گەڕەکی ئیســکان بەڕێوە بوو. لەو خەونەیدا هەمان ڕێگای گرتە بەر، ئەو ڕێگایەی بەردەوام لێوەی بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە. کاتێک بەلای ماڵەکانی گەڕەکی موفتیدا تێپەڕی، لەو کاتەدا زیاتر لە دە چەقەڵ لە گۆشـــتی کەرێکیان دەخوارد، کاتێک مەســـتوورە گەیشــتبووە نزیکیان، گوێی لێ بوو، بێجگە لە قریوەی چەقەڵەکان، هێشـتا گوێی لە دەنگی کەرەکە بوو کە بەزیندوویی گۆشـتی لاڕان

و ســەر پشــتیان دەبچڕی، ویســتی دەســتیان لێ بەرز بکاتەوە، پاشـــان لە ترســـاندا بێدەنگ بە لایاندا تێپەڕی، بەڕاکردن خۆی گەیاندەوە بەردەم شـــوقەکانی گەڕەکی ئیســـکان، لەوێوە لە چەقەڵەکانی ناو کۆڵانەکانی گەڕەکی موفتیی ڕوانی.

مەســـتوورە ئەو توورەکە بەنەی نوشـــتەکەی باپیرە شـــێخ شـەمسی تێدابوو بە پێشـی دەرگای ئاپارتمانەکەدا هەڵیواسـی، لێی ڕوانی و گوتی: "بەڵکو خوای ئەو مەشایەخە بمان پارێزێت!"

## ٢٨

کاتێک لە پلیکانەی باڵەخانەکە هاتە خوارەوە خۆی بە پێوە بۆ ڕاگیر نەدەکرا، وەکو دیسـان خۆی بە مرەبای سێوەکە مەست کردبێت، لەپێش چاوی ئەودا باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیستکان لە بەرزیدا تاوەکوو ئاستی هەورەکان چووبوون، لەسەر شۆستەی بەردەم باڵەخانەیەک بەدیار پاسکیلێکی شینەوە ڕاوەستا، لە خەیاڵی خۆیدا بەدوای ناوی خاوەنی پاسکیلەکەدا گەڕا، ئەو کچە ناوی چی بوو؟ یەکێک بوو لەو کچانەی مەستوورە بەردەوام دەیدواند و چاودێریی دەکرد. کاتێک ناوی کچەکەی بیر کەوتەوە، چەند جارێک لەبەر خۆیەوە گوتی: "مرواری... مرواری، کچێکی ژیکەڵەی قژکاڵی چاو سەوز بوو."

مرواری لە مەستوورەی پرسیبوو: "تۆ دەزانیت پاسکیل لێ بخوڕیت؟"

کاتێک مەستوورە ئەوەی بیر کەوتەوە، سواری پاسکیلەکە بوو، دەستی بە سوکانەکەیەوە گرت و هەوڵی دا قنج لەسەر کوشنەکەی دابنیشێت، قاچێکی لەسەر پایدەرەکەی دانابوو، وەکوو مرواری زوو زوو زەنگی لێ دەدا. هەرچەندە پاسکیلەکە لەشوێنی خۆی نەبزوابوو، بەڵام مەستوورە بە بەخەیاڵ؛ هاوشێوەی کچانی گەڕەک خێرا بەسەر شەقامی نێوان باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیسکاندا لە ڕاستەوە بۆ چەپ پاسکیلەکەی لێ خوڕی، هەندێک جار چاوی دادەخست و خێرا خێرا پایدەری لێدەدا، خەیاڵی لای کچانی گەڕەکی ئیسکان بوو، هەموویانی یەک یەک دەهێنایەوە پێش چاوی خۆی.

مەجیی لە دووریی دە مەترێکەوە لەناوەڕاستی شەقامەکەدا ڕاوەستابوو. کاتێک لێی ڕوانی، لەو خەیاڵەی دایبڕی. تووکە سپییەکەی مەجی تۆزی زەردیان لەسەر نیشتبوو. پێی پێشەوەی جارجار هەڵدەبڕی، کاتێک دەڕۆیشت؛ دەشەلی و بە پێشدا دەکەوت، زوو زوو لووتی لە حەوا دەکرد و دەینووزاند. مەستوورە لێی ڕوانی و بانگی کرد: "ئەرێ تۆش وەکوو من خوا غەزەبی لێ گرتوویت! بڕۆ! بڕۆ بە ڕێگای خۆتەوە! بۆ ناچیت لە جێگایەک بتۆپیت! بڕۆ و ملت بشکێنە، تەنها من و تۆ لێرەین، تەنها من و تۆ بەم ژیانە ڕازین، هیچ شتێک خەمی من و تۆ چارەسەر ناکات، خەمی لەدەستدان زۆر زۆر گرانە، ئیتر خۆ ناشکوری نەبێت تا بەیانی قسەت بۆ بکەم، تۆ لێم حاڵی نابیت!"

کاتێک مەستوورە ئەمەی بە مەجی گوت، دەستی لێ بەرز کردبووەوە. مەجی لە شوێنی خۆی پاڵ کەوت و بێدەنگ

لەدوورەوە لێی دەڕوانی. بەردەوام خۆڵێکی وردی زەرد دەباری، مەســـتوورە هەســـتی بە گەرمیی دەنکەزیخەکان دەکرد کاتێک دەکەوتنە ســەر پێســتی. بێ ئەوەی لە مەجی بڕوانێ، هەندێک جار خەیاڵی تەنها لەلای کوشنی پاسکیلەکە بوو کە ڕانەکانی توند بەملا و ئەولایدا گیر کردبوو، لەگەڵ هەموو جووڵانێکیدا موچڕکەیەک بە پشـــتیدا دەهات، بەناو دەمارەکانی لەشـــیدا تێدەپەڕی، هەســـتێک بەردەوام هێزی پێ دەدا و لەشی گەرم دا دەهات.

ســـــەر ســــــەکۆی بەردەمی ماڵەکان هەموو پەڕی وەریوی ڕەنگاوڕەنگ بوون، لەگەڵ شنە با گەرمەکەدا وەکوو پەپوولە بەرز دەبوونەوە و دیسان دەنیشتنەوە، پاشان تێکەڵ بە خۆڵە باریوەکە دەبوون. لەبەردەم ماڵەکان ئێسقان و خوێنی پەلەوەری لێ بوو، لە باڵکۆنی باڵەخانەکاندا پشیلەکان دەیانمیاواند، چەند جارێک سەری هەڵبڕی و لەبەر خۆیەوە گوتی: "تۆ بڵێیت کتە مابێت!"

بۆنی خوێن و کەلاکی تۆپیوی گیانداری دەکرد، شـــــووشـــــەی پەنجەرەی ماڵەکان هەندێکیان شـکابوون و با یاریی بە پەردەکان دەدرد، هێشـتا شـوێنەواری جێنینۆکی چەقەڵەکان بە ڕووی دەرگای باڵەخانەکانی گەڕەکی ئیسکانەوە دیار بوون.

## ٢٩

چۆڵبوونی شاری هەولێر و بە تایبەتی گەڕەکی ئیسکان، خەمی مەستوورەیان گرانتر کردبوو. لەنێوان ژیانی ڕاستی و خەون و خەیاڵدا، هیچ جیاوازییەکی نەدەبینی. خەڵکێکی زۆر بۆ هەولێر گەڕابوونەوە، بەڵام مەستوورە ڕۆژانە تەنها بەدوای کتەی پشیلەی و مەجیدە شەلدا دەگەڕا، هەر چەندە لە ماڵەوە وەکوو جاران تەنیا نەبوو، مەجی جێگای شێخ بایز و کتەی پشیلەی بۆ پڕ کردبووەوە، لە ماڵەکەیدا وەکوو هاودەنگ و هاوڕێیەکی لێ هاتبوو، بەردەوام قسەی لەگەڵدا دەکرد و چیرۆک و بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ دەگێڕایەوە، بەڵام زوو زوو بیری کتەی دەکەوتەوە و بەدەوری خۆیدا دەیڕوانی و بانگی دەکرد.

ئەو شەوە پێش ئەوەی چاوی بچێتە خەو، خەیاڵی لای ئەو ناوە بوو، زوو زوو لە بەر خۆیەوە دەیگوت: "مەجی... مەجی..."

پاشان ئەو پرسیارەی لە خۆی دەکرد، تۆ بڵێیت مەجیدە شەلی دراوسێیان بەوە نەزانێت کە ئەم سەگێکی بە ناوی ئەوەوە ناو ناوە! گفتی ئەوەی بە خۆی دابوو، گوتبووی: "ئەگەر مەجیدە شەل لە ناکاو پەیدا بوو، ئیتر ئەو سەگە بە ناوی مەجییەوە بانگ ناکەم!"

لە کاتێکدا مەستوورە بیری لەمە دەکردەوە، لە ئەپارتمانەکەیماڵی مەجیدە شەلی دراوسێیانەوە گوێی لە دەنگەدەنگ بوو. ئەو شەوە تاوەکوو چاوی چووبووە خەو، سەری بە ڕووی زەویی ماڵەکەیدا دەنا و گوێی لە نهۆمی خوارەوە دەگرت.

ئەو شەوە بەو خەیاڵەوە خەوی لێ کەوت، لە خەونیدا لە بیابانێکدا مەجی بەدەوری مەستوورەدا دەسووڕایەوە، ئەویش بانگی لە مەجی دەکرد: "مەجی! مەجی! ئەرێ تۆ منت بۆ کوێ هێناوە!" تاوەکوو لە دوورەوە تارماییی خانووی موجەمەعێکی بینی، ئەو موجەمەعەی مینا و گوڵە بۆیان باس کردبوو، ئەو شوێنەی پێ دەچوو خدر و منداڵەکانی لێ بن، ئەو شوێنەی کە لە بیابانێکی زۆر زۆر دوور بوو، هەستی دەکرد ڕۆژێک یان بگرە چەندین ڕۆژ بەڕێوەیە، شوێنەواری هیچ ڕێگایەک دیار نەبوو، تەنها ئەوەندە نەبێت دیواری خانووی موجەمەعەکەی لێوە دیار بوو، مەجی شەلەشەل چەند مەترێک لە پێشییەوە و ئەویش شوێنپێکانی ئەوی هەڵدەگرتەوە.

پێش ئەوەی بگەنە نزیک ماڵەکان و دەم کۆڵانەکان، لە دووریی سەد مەترێکەوە کە هەردووکیان بەئەستەم خۆیان بەپێوە بۆ ڕاگیر دەکرا؛ ڕاوەستان. لەناکاو لەناو کۆڵانەکانەوە دەست بە وەڕین کرا،

هەردووکیان بێدەنگ لە جێگای خۆیان وەستابوون. گەلەسەگێک لەناو ماڵ و کۆڵانەکانەوە دەرکەوتن، سەگەکان ڕەش و لۆقن بوون و بەردەوام بەناو یەکدا دەچوون، بیست سەگێک زیاتر دەبوون، هەندێکیان ڕوویان دەکردە حەوا و دەوەڕین، چەند سەگێک لە پێشەوە ددانەکانیان پیشانی مەستوورە و مەجی دەدا، مەستوورە لە مەجیی ڕوانی: "ئەم دڕندانە لێرەن! کەواتە لەو موجەمەعە بەشەری بەزیندوویی تێدا ماوە!"

مەستوورە لە کاتێکدا ئەمەی گوت، سەگەکان بەرەو ڕوویان دەهاتن، مەجی خۆی دایە پشتی مەستوورە و سەری بردبووە نێوان قاچەکانی، لەوێوە بە دەنگێکی کز و بەترسەوە لێیان دەوەڕی. مەستوورە لە مەجیی ڕوانی و گوتی: "ناهەقت نییە لێیان بترسیت!"

کاتێک مەستوورە ئەمەی گوت، سەری شۆڕ کردبووەوە و لە مەجیی دەڕوانی، لەو کاتەدا لە گەڕەکەکانی ناو موجەمەعەکەوە تەقەی فیشەک دەبیسترا، پێش ئەوەی مەستوورە ڕابچڵەکێت و دەنگێکی لەناکاوی لێوە بێت، دەنگێک کە زیاتر ترس لە قوڕگیدا دەریدەپەڕاند، مەجی لەنێوان قاچەکانیدا ڕاچڵەکی و قرووسکاندی، مەستوورەی بەجێ هێشت و بەو ڕێگایەدا کە شوێنەواری دیار نەمابوو؛ گەڕایەوە. لە ترسی دەنگی گوللەکان نەیتوانی لە سەگەکان بڕوانێ، ئاوڕی دابووەوە و چاوی لەدوای مەجی بوو، تاوەکوو لەناو تەپوتۆزی بیابانەکەدا لە چاوی ون بوو؛ لێی ڕوانی. ئاگای لای سەگەکان نەمابوو، تەنها ئەوەندە نەبێت کە لە خەیاڵیدا چاوەڕوان بوو ئاخۆ کەی جەستەی بەر کەڵبەی تیژیان دەکەوێت.

نەیدەتوانی خۆی لەســـەر پێکانی ڕابگرێت، باڵەکانی قورس بووبوون و وەکوو پارچەیەک پەڕۆی تەڕ بەملا و ئەولایدا شـۆڕ بووبوونەوە، ئارەقەیەکی ســـاردی دەردابوو، بە چۆکدا هات و کەوتە ســـەر لمی بیابانەکە. تاوەکوو تەقەی فیشـــەکەکان زیادی دەکرد، ئـەو زیـاتر لە پەلوپۆ دەکەوت و بێهێز دەبوو، خوێنی بە گوژم شـەپۆلیان بە دیوارەکانی ڕۆحیدا دەدا. پشـتی کردبووە ســـەگەکان و بەگاگۆڵکێ بەدوای مەجیدا چوو، بە چاوی پڕ لە فرمێسـکەوە هەناسـەی قووڵی هەڵدەکێشـا، لەبەر ئازاری سـەر سنگی چنگی لە لمە گەرمەکە گیر دەکرد، بەردەوام پڕ بە سییەکانی هەناسـەی هەڵدەمژی و پاشـان بەگوژم هەناسـەی دەدایەوە. لە کاتێکدا بۆنی هەناسـەی سـەگەکانی دەکرد، وەڕین و دانەجیڕەیان لەپاڵ گوێکانیدا بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەمکوژێت، ئەم ترسـە دەمکوژێت، ترس لە دەنگی تەقینی ئەو فیشـــەکە نەعلەتیيانە دەمکوژێت!"

بەدەم خەوەوە دەســـتی کردبوو بە ڕنینەوەی قژی، ناو چنگی پڕ بوو لە مووی سوور، خەیاڵی هێشتا لای گەیشتنی سەگەکان بوو، دەنگی گوللەکان هێشـــتا لەناو گوێکانیدا دەزرینگانەوە. مەجی هاتبووە سـەر تەختی خەوەکەی و چوارپەلی بەملا و ئەولایدا بڵاو کردبووەوە، سـەری بە سـەریدا داهێشـتبوو، لەگەڵ مەسـتوورەدا دەینووزاند و زمانی بە ڕوومەتیدا دەهێنا. پێشـــتر بەتانییەکانی ڕاکێشـــابووە ســـەر زەوییەکە، هەموو بەیانییەک کۆڵی لێ نەدەدا تاوەکوو لە خەو بەئاگای دەهێنا، ئەویش کاتێک لە خەو بەئاگا

دەهات و چاوی هەڵدەبڕی، باوەشی بە ملی مەجیدا دەکرد و بەدەم گریانەوە دەستی دەکرد بە لاواندنەوە.

بەڵام ئەم جارەیان بەپێچەوانەوە، زریکەیەکی لەناکاوی لێوە هات و دوای ئەوەی پاڵی بە مەجییەوە نا، لەسەر تەختی خەوەکەی خۆی ڕاست کردەوە و دەستی لەبەر ئەژنۆکانی هەڵپێکان، ڕووی گرژ کرد و بێدەنگ و سەرسام لە چاوی مەجیی ڕوانی.

## ٣٠

کات تێپەڕی و مەستوورە هێشتا لە ژوورەوە خۆی سجن کردبوو، خەڵکی بۆ ناو شاری هەولێر گەڕابوونەوە، ژیان لەناو شار و گەڕەکاندا ئاسایی بووبووەوە.

ئەو بەیانییە لە دەنگی منداڵانی گەڕەک و هۆڕینلێدانی تاکسییەکان لە خەو هەستابوو، لە دوور و بە ئەستەم گوێی لە لێدانی زەنگی پاسکیلێک بوو، وەکوو بەیانیانی ڕۆژانی پێشوو بێدەنگ لە بنمیچی ژوورەکەی نەڕوانی، هەستی کرد بە دەم خەوەوە نەگریابوو، چاوی و ڕوومەتەکانی تەڕ نەبوون، پڕ بە سییەکانی هەناسەی قووڵی هەڵمژی، دەستێکی بە لێواری تەختی خەوەکەیەوە گرت و هەستایە سەر پێ. دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕۆژە، عەزیبە سپییە گوڵدارەکەی لەناو سەتڵێکی تاید و ئاو نابوو، بەڵام

هێشتا دامێنی پەڵە خوێنەکانی پێوە دیار بوو، خوێنەکە بە ڕووی قوماشەکەدا بڵاو بووبووەوە، وەکوو ڕەنگی گوڵەباخێک لەسەر ڕووی قوماشەکە دیار بوو. ئێوارەی ڕۆژی پێشوو عەزییەکەی لەبەر کردبوو، بەماڵەکەدا گەڕابوو، پاشان دوای ئەوەی ماندوو بووبوو، لەسەر تەختی خەوەکەی خەوی لێکەوتبوو.

دەستی بەسەر دڵیدا دەهێنا، پەرداخێک ئاوی بە دەستەوە بوو، لەگەڵ بیرکردنەوەدا زوو زوو قومی لێ دەدا، بەسەرسامییەوە چاوی بە ماڵەکەیدا دەگێڕا، پەردەکانی دادابووەوە و ئیتر لە دەرەوەی نەڕوانی، سەری لەوە سوڕمابوو کە ئەو شەوە خەونی نەبینیبوو، وەکوو گیاندارێک لە قەفەزێک یان کۆت و زنجیر ڕزگاری بووبێت، لە تەختی خەوەکەی ڕوانی و دەستی بەسەر دۆشەک و بەتانییەکاندا هێنا، وەکوو بیەوێت بەدوای شوێنەواری شتێکدا بگەڕێت، پاشان دوو پەنجەی لە پەرداخە ئاوەکەدا تەڕ کرد و بەسەر برۆکانیدا هێنانی، گڵۆپی ژوورەکەی کوژاندەوە و لە تاریکیی ژوورەکەدا لەسەر تەختی خەوەکەی ڕاکشا، وەکو بییەوێت بیر لە شتێک بکاتەوە و نەیدەتوانی، بەردەوام سەری ژانی دەکرد، لەبەر خۆیەوە گوتی: "شتێکم لێ ون بووە! هەست دەکەم شتێکم لێ ون بووە!"

لەنێوان پەردە ئەستوورەکانەوە بەئەستەم تیشکی خۆر خۆی گەیاندبووە سەر دیواری بەرامبەر تەختی خەوەکەی، هەندێک جار مەستوورە بە ڕووناکیی سەر ئەو دیوارەی ژوورەکەیدا دەیزانی کات چەندە.

هەستا و پەردەکانی ڕێک کردەوە، دیار بوو ویستی ڕووناکییان لێ ببڕێت. وەکوو یادەوەرییەکی بیر کەوتبێتەوە، لەسەر ڕانەکانی و سەر سنگی ڕوانی و دەستی بەسەر ڕووی عەزییەکەیدا هێنا، لەناو دەرپێ کورتەکەیدا پارچە پەڕۆیەکی سپیی دەرهێنا، دوو جار پەڕۆکەی هەڵگێڕایەوە، چوو گڵۆپی ژوورەکەی داگیرساند و دیسان لەبەر ڕووناکییەکەدا لە پەڕۆکەی ڕوانییەوە و بۆنی پێوە کرد: "خوێنم لێ نەهاتووە، ئەوە چەند ڕۆژە دڵۆپێک خوێن چییە لێم نەڕۆیشتووە!"

ئەوەی بیرکەوتەوە کە پێشتر بەردەوام خوێنی لێ دەهات، پەڕۆکەی خستەوە ناو دەرپێ کورتەکەی، وەکوو بەچرپە لەگەڵ خۆیدا بدوێت: "خوێنم لەبەر ناڕوات!"

ڕووناکیی تیشکی خۆر دەیدا لە ڕووی پەردەکان، مەستوورە تاوەکوو دوواینیوەڕۆ لەسەرپشت کەوتبوو، زوو زوو زەردەخەنەیەک دەکەوتە سەر لێوەکانی، بێدەنگ لە بنمیچی ژوورەکەی دەڕوانی. کاتێک لەسەر لێواری تەختی خەوەکەی دانیشت و چەند جارێک هەناسەی قووڵی هەڵکێشا، مەجی لەژێر تەختی خەوەکەیدا سەری هێنایە دەرەوە و بۆنی بە سەر پێکانیەوە کرد، ڕاچڵەکی و پڕ بە قوڕگی هاواری کرد، هاوارێک وەکوو چۆن لە کاتی بیستنی دەنگی گوللەکاندا دەیکرد. لەسەر تەختی خەوەکەی بەپێوە وەستابوو، مەجی لێی ڕوانی و سەری لار کردەوە و قرووسکاندی، مەستوورە دەستێکی بەسەر سنگیەوە و دەستەکەی تری بۆ لای مەجی درێژ کرد و هاواری کرد: "ئەمە تۆ لە کوێوە

پەیدا بوویت، توخنم نەکەویت، گڵاویت، ماڵی من و ســـــەگیان نەوتووە!"

مەجی کلکی ڕادەوەشاند و نەرم لە مەستوورە دەوەڕی، لەسەر تەختی خەوەکەی دابەزی و چوو لە مەتبەخەکەی گسکێکی هێنا و چەند جارێ بەرەو ڕووی مەجی ڕایوەشـــاند، مەجی بۆ ناو داڵانەکەی پاشـــەوپاش ڕۆیشـــت، بێ ئەوەی چاوی بتروکێنێت لێی ڕوانی. مەســـتوورە چوو دەرگای ئەپارتمانەکەی کردەوە و مەجیی کردە دەرەوە. کاتێک مەجی ویســـتی بە لایدا بۆ ژوورەوە بێت، مەستوورە هاواری کرد: "بۆ دەرەوە، سەگی گڵاو! بۆ دەرەوە! بڕۆ! دەی بڕۆ بۆ دەشت و کەلاوەیەک!"

لەو کاتەدا بارام و حەنان لەبەردەم دەرگای ئەپارتمانەکەدا پەیدا بوون، مەســـتوورە بێدەنگ لە بارام و حەنانی ڕوانی، مەجییش لووتی بەرز کردبووەوە و بۆنی دەکردن و کلکی ڕادەوەشـــاند، کاتێک بارام ویســـتی بەلای مەســـتوورەدا بۆ ژوورەوە تێپەڕێت، مەســـتوورە دەســـتی بە ســـنگیەوە نا و خۆی لە پێشـــیەوە چووە ژوورەوە و دەرگای ئەپارتمانەکەی بەدوای خۆیدا داخســـت، چوو لە پەنجەرەی مەتبەخەکەیەوە لێی ڕوانین. بارام و حەنان لە شانی یەکەوە وەســـتابوون، هەردووکیان پێکەوە بانگیان لە مەســـتوورە دەکرد: "مەستوورە خان ئێمەین، ئەوە دەڵێیت ناماننناسیتەوە!"

بـارام دەموچـاوی بـە ڕووی شـــووشـــەی پـەنجـەرەکـەوە نووساندبوو، بانگی دەکرد، پاشان بە سەری پەنجەکانی سێ جار لە شـووشـــەکەی دا. مەســـتوورە دوو هەنگاو لە پەنجەرەکە دوور کەوتەوە، ماســـوولکەی دەموچاوی گرژ کرد و بەتووڕەییەوە لە

بارامی ڕوانی، پاشـــان حەنان هاتبوو لە شـــانیەوە وەســـتابوو، مەســـتوورە بێ ئەوەی وەڵامیان بداتەوە، پشـــتی تێ کردن و مەتبەخەکەی بەجێ هێشـت، چوو لەبەردەم ئاوێنەی گەرماوەکەیدا ڕاوەسـتا، دەسـتی تەڕ کرد و بە قژیدا هێنای، ئێخەی عەزییەکەی ڕاست کردەوە و دەستی بەسەر گوڵەباغە سوورەکاندا هێنا.

تاوەکوو ئێوارەی ئەو ڕۆژە، مەجی بێئارام چنگی بە دەرگاکەوە بوو. بارام و حەنان زیاتر لە کاتژمێرێک لە دەرگا و پەنجەرەی مەتبەخەکەیان دەدا، بارام زوو زوو مەستوورەی بە ناوی خۆیەوە بانگ دەکرد، پاشان دەیگوت: "مەستوورە، هاتووم تاوەکوو بۆ دێی جەلەمۆردت بەرمەوە!"

بارام کاتێک ئەمەی دەگوت، قوڕگی پڕ بوو لە گریان و دەم و لووتی توند بە ڕووی شـووشـەی پەنجەرەی مەتبەخەکەدا گرتبوو: "دوا کەوتم، توو خوا مەســـتوورە بمبورە، دەزانم دوا کەوتم! پێم گوتیت پێکەوە بۆ دێی جەلەمۆرد دەچین! بە خوا هەر چۆنێک بێت بۆ ئاوایی جەلەمۆردت دەبەمەوە!"

مەســـتوورە چووبوو لەســـەر تەختی خەوەکەی ڕاکشـــابوو، دەسـتی پڕ بوو لە گەڵای وشـکی درەختی دارمۆرد، دوای ئەوەی بۆنی پێوە دەکرد، لـەبـەر خۆیـەوە بەنووزەنووز گۆرانیی دەگوت، دێڕێک لێرە و وشـەیەک لەوێ، تێکەڵی دەکرد بەسـەر یەکدا. تەنها شـتێک کە لەو کاتەدا بیری لێ دەکردەوە و خەیاڵی داگیر کردبوو، ناوهێنانی خوا بوو کە تاوەکوو ئەو ســـاتەش لە خەیاڵیدا دەنگی

دەدایەوە، بە جۆرێک ڕاهاتبوو بەردەوام لەبەر خۆیەوە دەیوتەوە، زۆر جار دەیگوت: "چی بکەم، وا بزانم بە مەلاشومەوە نووساوە!"

لە زمانیدا جێگای خۆی گرتبوو، هەندێک جار بەترسەوە دەیگوت، یان وەکوو هەناسەدانی لێ هاتبوو، ئەو پێی وا بوو بۆ بانگکردنی یادەوەرییەکانی؛ دەبێ بانگ لەو بکات، بۆ بینینەوەی کچەکانی؛ دەبێت بانگ لەو بکات. کە منداڵ بوو، لە کاتێکدا دەترسا؛ هاواری لەو دەکرد، وردە وردە بووبوو بە وشەیەکی ئاسایی و لەگەڵ هەموو باوێشکدانێکیشدا بانگی لەو دەکرد. جاران کاتێک ئەو وشەیەی لە دەم دەردەچوو، کتە لەگەڵیدا دەیمیاواند، یان دەهات و دەچووە باوەشی، ئەویش پێی دەگوت: "کتە، ئەوە بە ناوی خۆت تێنەگەیت!"

وەکوو لەناو ماڵەکەیدا بن، دەنگی کچەکانی دەهاتە گوێ. فرمێسک بە چاویدا دەهاتنە خوار و سەری لەسەر پشتییەکەی بۆ نەدەجوولا، لەژێر لێوەوە گوتی: "حەزم دەکرد لەم کاتەمدا، لە قوولایی دڵمەوە بمتوانیایە بانگت بکەم، دەزانم تۆ دەبوویت بە هێزێک تاوەکوو بەرگەی ئەو هەموو ئازارەم بگرم، ئیتر پەنات پێ نابەم و ناوت ناهێنم. دڵگرانم، زۆر دڵگرانم کە دڵم لێت ڕەنجاوە، با بە ناشکوری بێت، من ناشکورم و منەتم پێت نییە. تەنانەت ئەگەر بۆ زیندوو بوونەیش بێت!"

دوودڵ بوو لەوەی ئیتر ناوی بەسەر زوبانیدا بێت، بەڵام وەکوو خۆی دەیگوت، چی بکەم دەڵێیت بە مەلاشومەوە نووساوە. هەر چەندە وەکوو جاران گوێت لەو وشەیە نەدەبوو، بەڵام لە خەیاڵی خۆیدا زوو زوو بیری لێ دەکردەوە و ناوی دەهێنا.

چاوی نووقاندبوو، بێدەنگ دەستی لەسەر سنگی لە یەک هەڵپێکابوو، دەنگە گڕەکەی خدر و باعەی بزنەکان و دەنگی کچەکانی دەهاتنە گوێ، لەژێر لێوەوە و زۆر بەئەسپایی "بەڵێ"ی بۆ دەکردن، پاشان تاوێک بێدەنگ بووبوو، هێواش دەستەکانی بەملا و ئەولایدا شۆڕ بووبوونەوە، گەڵای وشکی دارمۆرد بەسەر سنگیدا بڕابوو.

دەنگی گۆرانیگوتنی کچەکانی مەستوورە لەگەڵ میاوەمیاوی کتە و دەنگی شێخ بایز تێکەڵ دەبوون، زووزوو وەڕینی مەجی و لەدەرگادان و دەنگی بارام و حەنان کپی و بێدەنگیی ماڵەکەیان دەشکاند، کە بانگیان دەکرد: "مەستوورە، مەستوورە."

## زانیاریی پێویست:

**جەلەمۆرد:** گوندێکە دەکەوێتە بناری خاڵخالانەوە، سـەر بە ناحیەی ئاغجەلەری قەزای چەمچەماڵە. (١٩٨٨/٥/٥ زیاتر لە چوارسـەدوپەنجا کەسـیان لێ ئەنفال کرا.) لە کۆندا "جێ لە مۆرد" بووە، ئەمەیش لەوەوە هاتووە کە خەڵکەکە ئاوابییەکەی خۆیان لەنێو پەڵەی مۆردەکاندا سـاز کردووە. وردەوردە نـاوەکە بووە بە جێلەمۆرد و جەلەمۆرد؛ خەڵکی جەلەمۆرد یا جێلەمۆرد لە سـالانی دوای هەزاروهەشـتسـەدەوە، لە زاخۆوە هاتوونەتە ناوچەی شوان کە لە هۆزی "بزێنی"ن.

**باوەرووشە:** چەمێکە لە بناری خاڵخالان و ناوچەی شوان.

**ناوچەی شوان:** خەڵکی ناوچەکە "ناوشوان"یشی پێ دەڵێن؛ ئەم ناوچەیە، دوو بەشە. بەشی شوانی کێشک و بەشی شوانی خاسە.

**دارمۆرد:** دەوەنێکی بەردارە و گەلایەکی بۆنخۆشـی هەیە، لە ناوچەی شـوان و لە هەندێک لە شـاخەکانی قەرەداخ و دۆڵی جافایەتیدا دەڕوێت. گەلێک شوێن بەناویەوە ناو نراون؛ شاخی سەرمۆرد، گوندی جەلەمۆرد، گوندی مۆرد، هەروەها لە کولتووری کۆنی کوردەواریدا وەک ڕووەکێکی پیرۆز ناوی براوە.

ڕۆمانی خەمی مەستوورە، پێمان دەڵێت:
هەر کەسێک (چ کورد بێ یا عەرەب، چ فارس بێ یا تورک)، گوێی لە قسەی شایەتحاڵێکی تاوانەکانی ئەنفال گرتبێت، ئەگەر تۆزقاڵێک هەستی مرۆڤانەی تێدابێت، خۆی، بێ ئەملا و ئەولا، دەبێتە شایەتحاڵ.

**Miran Abraham**

# Mastura's grief

Novel

٧٠٠٠ دینار

ناوەندی بڵاوکردنەوەی کەیر